# دیوانی وەلی دێوانە

## سۆرانی و هەورامی

وەرگێڕاوی رازی



هەوڵ بدا نووسراوێک وەک دیوانی «وەلی دێوانە» لە شێعری هەورامی یەوە وەرگێڕێ بۆ سەر شێوەی سۆرانی، هەر بە شیعر بە ڕەنگێکی قەشەنگی دڵچەسپی تەڕی مەزەداری پاراو.

کاک «ڕازی» ئەم نوسراوە، یان ئەم گوڵدەستەیەی بۆ ناردم کە بی خوێنمەوە و بۆی هەڵسەنگێنم و چەوتە و چێڵەی بگرمەوە و خراپی لە چاک جیا بکەمەوە و بە قەڵبیری ووردبینی گێژ و تەڵەی بکەم و بە پاک و خاوێنی بۆی بنێرمەوە.

بەڵێ، منیش چاوێکم لێ کرد و بە دووچاو زۆر بە ووردی و لەسەرخۆ دوو سێ جار خوێندمەوە و سەر و خوار و سەر و ژوورم کرد، بەڕاستی و بە پێ ی زانینی خۆم، لەم بازارەدا ئەم «دیوانە»م زۆر بەدڵە و لە لام باشە و زۆر دڵپەسەندی ئەکەم وە هیچ کەم و کوڕی یەکم تیا نەدی. ئەم دیوانە کەلێنێکی گەورەی لە مەکتەبی کوردی‌دا پڕ کردۆتەوە. وە هیوای بەتین و ئومێدی گەورەم ئەمەیە کە کاک «ڕازی» هەر بەم نوسراوە بەنرخەوە نەوەستێ، بەڵکو ناو بە ناو شتی ئاوا بەتام و ڕەنگ و بۆ، بخاتە ئاراوە، تا هەموان لێ ی بەهرەمەند بن و وێژەر و هونەری تریش چاوی لێ بکەن.

خوێنەرەوەی بەڕێز لە بارەی ئەم چەند دێڕەی کە من نوسیومە، ئەگەر باوەڕ ناکەی، ئەوە ئەرز و ئەوە گەز، کاک «ڕازی» دوکانەکەی وا لەسەر شەقامی مەولەوی، بچۆ دیدەنی یەکی بکە. ئەبینی کە کاک «ڕازی» هەرچەند ئەدیب و شاعیرە، خۆش ڕوو و خۆش نوکتە بازیشە، هەرگیز میوان لەلای وەڕەس نابێ، بەڕۆژ خەریکی سەعات سازی یە و بە ڕەنجی شان و هەنای چاو «نان» بۆ ووردەکانی پەیدا ئەکا، بە شەویش خەریکی هونراوە و وێژە و کۆکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی یە، لە «خوا»م داوایە سەرکەوتووبێ.

**سولەیمانی موحەممەد موستەفا کوردی**

## ئەمەش دەقی نوسراوەکەی کاک «صابر رازی»یە...:

ناوم «صابر سعید شکری»یە، نازناویشم (ڕازی)یە، لە ساڵی ١٩٣٧ی زایینی لە شاری (سلێمانی) لەگەڕەکی (مەلکەندی) پێم ناوەتە ژیان و هاتومەتە ئەم جیهانە پڕ ئەشکەنجە و ئازارە، هەر بە منداڵی مەینەت یەخەی گرتم، جیاوازی کەوتە نێوان باوکم و دایکم، ئەوان لێک جیا بونەوە، منیش کەوتمە ژێر جەوری باوەژن و چەپۆکی ڕەشی زەمانە، جا لەبەر ئەم هۆیە، نەنێررامە قوتابخانە و دڵسۆزێکم نەبوو دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکا، بۆیە ئەڵێم: نەلە قوتابخانە خوێندومە، نەلای مەلا، ئەم کوێرە خەتەیشم لە هەوڵ و کۆششی خۆم چنگ کەوتووە، هەر لە منالیمەوە زۆر ئارەزوی هۆنراوە و چیرۆکم ئەکرد، هەرکەسێک هۆنراوەیەکی بخوێنایەتەوە ئەوەندەم ئارەزو لێی بوو هەرچۆنێک بوو ئەو هۆنراوەیەم لەبەر ئەکرد،، ئێستا کەوتومەتە ژێر باری پەروەردەی ماڵ و مناڵ، ئەگەر ماوەیەکی کەم دەرفەتێکم بێ، دەست ئەدەمە پێنووس و چیم بۆ هەڵسووڕا شاش و شەش تەقەڵ پێکەوە ئەنێم، ئەمەش بۆیە ئەکەم هەتا نوسینانە بەرەو ڕێیەکی ڕاستم ببا و بمگەیێنێتە ئاواتی دڵ، ئینجا نازانم ئەگەم بەو ئاواتە یان‌نا، ئەمە کورتەی ژیانمە و ئەڵێم:

**نە بەکاوڕی تێرگیانە نە بەبەرخی تێر شیر**

**ئـیتر لەم ژیـــنە تـاڵە چـیم بـێتەوە بـیر**

**ڕازی**

## کورتە باسێک لە کۆکردنەوەی بەرهەمی «وەلی دێوانە»

وەکو بەرهەمی زۆربەی شاعیرە کانمان دەماودەم و پشتاوپشت هۆنراوەکانی «وەلی دێوانە» بیستراون و وەرگیراون، جارجارەش بڵاو بونەتەوە، بۆ یەکەم جار پرشنگی هۆنراوەکانی «وەلی» لەسەر لاپەڕەی ژیان...و...ژین...خۆی نواند بە شێوەی سلێمانی لە ڕۆژنامەی «ژیان و ژین»دا بڵاو ئەکرایەوە، بەڕاستی هونەری نەمر «پیرەمێرد» هەوڵێکی زۆری ئەدا لەپێناوی زیندو کردنەوەی شاعیرە کۆنەکان و هۆنراوە بەنرخەکانیانی بەشێوەیەکی ـ هەتا حەز ئەکەی ـ ڕێک و پێک و جوان ئەی خستنە پێش چاوی خوێندەوارانی بەڕێز.

تا لەساڵی ١٩٧٠ز کاک «مەحمود خاکی» هۆنراوەکانی «وەلی دێوانە»ی بە هەردووشێوەکە کۆیکردنەوە و چاپی کردن، بەڵام بەداخەوە هەندێ کەم و کوڕی تیا بەدی ئەکرا، تەنانەت هۆنراوەی شاعیرەکانی تری تیا ئەبینرا، وەکو: «بێسارانی» و هی تریش، بە هەرحاڵ کاکی بەڕێز شایانی ڕێزە.

دیسان لە ساڵی ١٩٧٦ز «وەلی» بۆ جارێکی تر خۆی نواند، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێک و جوان و شێوە ئەسڵیەکەی لە کۆکردنەوەونوسینی مامۆستای بەڕێز کاک «عوسمان هەورامی» و (کۆڕی زانیاری) چاپی کردووە، بڵاوی کردەوەتەوە.

چی! پاڵی پێوەنام بۆ گۆڕینی هۆنراوەکانی «وەلی»؟: کاتێ دیوانە جوانەکەی «وەلی» کەوتە بازاڕەوە، زۆر کەسم ئەدی بەدەستیەوەبوو بەدەم ڕێوە ئەیانخوێندەوە، کاتێ زانیم هاوڕێیەکم هاتەلام دیوانەکەی «وەلی»

بـەدەستەوە بـوو وتـم: هـاورێم هـۆنراوەکـانی «وەلی»ت بـەلاوە چـۆنە؟ بەساردییەکەوە وەڵامی دامەوە و وتـی: بـرا بـەڕاستی هـەرئەو دوو سـێ هۆنراوەیەی هەیە کە کراوە بەگۆرانی. ناحەقیشی نیە!، چونکە هـەرلەو دوو سێ هۆنراوەیـە ئـەگـەیشت کـە هـونەری بـەڕێز و نـەمر «پیرەمێرد» وەری گێڕابوو، منیش وتم: نەکاکیخۆم هەتا بڵێی هۆنراوەکانی بەتام و بەکـوڵە هۆنراوەی لە هۆنراوەی تـەڕ و پاراوتـرە، تـۆیش نـاحەقت نـیە، چـونکە لە شێوەکەی تێناگەی، خـۆزگە سـەد خـۆزگە...! هـونەری نـەمر «پـیرەمێرد» هەموی وەرگێڕایەتە سەر شێوەی سۆرانی، تا هەموو خوێندەوارێکی بەڕێز باش لە سۆزی دەروونی «وەلی» تێبگەیشتایە، هەر لەوکاتەدا بـڕیارمدا کـە هۆنراوەکانی «وەلی» کەم و زۆر کە لەم (دیوان)ەدایە بیگۆڕمە سەر شێوەی سۆرانی، هەرچەندە شێوەی (سۆرانـی) و شـێوەی (هـەورامـی) هـەردوولا هەرکوردین و (ئاری) نەژادن، بەڵام لە وتووێژا هەندێ جیاوازی تیایە.

با بینە سەر باسی گۆڕین: گۆڕین لە شێوەیێکەوە بۆ شێوەیەکیتر هەروا سادەنیە، گەلێک دیققەت و تەوانایی ئەوەی بەتایبەتی هۆنراوەکێش و قافیەی ئەوێت، سۆز و تینی هەیە، جا ئـەوەش لە ووزەی زۆرکـەسدا نـیە، ئـەوەی بـێتەسەر ئـەم ڕێگـەیە ئـەبێ دەسـتێ بـەهێزی هـەبێ لە نـاسینی وێـژە و هۆنراوەدا، منیش هاتمە سەر ئـەم ڕێـیـە و دەستلەدەست و تـەوانـایی لە یەزدانی بێنیاز، هەرچەند هەوڵی زۆرمدا لەپێناوی ژیان و بەسەرهاتی ئـەم هونەرە بـەنرخـە، لە ئـەنجامدا بـە یـارمەتی چـەند دڵـسـۆزێک و بـە هـەزار کوێرەوەری گەیاندمە ئەم جێیە کەوا کورتەیەک لە ژیانی «وەلی» و «شەم» پەیاکەم.

## کورتەیەک لە ژیانی «وەلی دێوانە»

هونەر ناوی «وەلید»ە کوڕی کوێخا «موحەممەد»ە، کوێخا موحەممەد کوێخای هۆزێ‌بوو لە تیرەی (کەماڵەیی) باوکی «وەلید» بە کوێخا (حەمە سوور) بەناوبانگ بووە، گەلێک داراو خاوەن ماڵات بووە، هەتابڵێ‌ی دەست و دڵخاوێن و خێرخوا بووە، لەبەر ئەوەی زۆر حەزی لەڕێ‌ی خواناسین و پیاوچاکی کردوە، پەیمانی لەگەڵ خوای خۆیدا بەستوە کە خوا ئەولادی نێرینەی پێ‌بەخشی ناوی‌بنێ «وەلید...» چونکە (خالیدی کوری وەلید) گەلێک تێ کۆشاوە لەڕێ‌ی دین و دیانەتدا، بۆیە «کوێخا»ش ئەمشەرتەی کردوە.

تا لەسالی ١١٨٠کۆچی، «وەلید» پێ‌ی‌نایە ناو دونیای پڕ لە کوێرەوەری و دڵشکاوی. بەڵێ... خوا کوڕی بەکوێخا بەخشی‌و ئاواتی هاتەدی‌و ناوی‌نا «وەلید»، ئەوساڵەی خوا «وەلید»ی بەخشی بەکوێخا، هۆزی کوێخا لەدشتی (شاکەل) و (شیروانە) هەڵیان‌دابوو، کوێخای باوکی وەلیدی زۆر خۆش ئەویست وە بڕیاری‌دا کە مامۆستایەکی بۆ پەیدا بکاو فێری قورئان و خوێندنی بکا، خۆی گەیاندە شاری (سلێمانی) لەپاش هەوڵ‌دان‌و ڕاسپاردنێکی زۆر فەقێ‌یەکی لە مزگەوتەکاندا پەیداکردو بردی بۆ هۆزەکەی، هەم بۆ پێش‌نوێژی، هەم بۆ فێرکردنی «وەلید»، فەقێ بوو بە مەلای خێڵ، ناوی فەقێ «یوسف» بوو پێ‌یان ئەووت «مەلا یۆسۆ»، مەلا یۆسۆ... زیرەک و پاک و خاوێن بوو، کوێخا زۆر چوو بە دڵیا وە هەر لە هۆزەکەی خۆی ژنی بۆهێنا و هەندێ ئاژەڵ‌و ماڵیاتی پێ‌بەخشی. «مەلا» بوو بە مەلای یەکجاری‌یان، «وەلید»ی فێری خوێندن و خوێندنەوە و نوسینی کرد،

خوێندن و خوێندنەوەی «وەلید» دەنگی دایەوە لە هەموو هۆزو تیرەکانی «کەماڵەیی»دا هەتا دەنگ گەیشتە هۆزی باوکی شەم.

## کورتەیەک لە ژیانی «شەم»

شەم ناوی «شەمسە»یە کچی «کۆیخا قادر»ە، کۆیخا قادر کوێخای هۆزێکی تر بوو هەر لە تیرەی (کەماڵەیی)ەکۆیخا زۆر هەولّی دا نە فەقێیەک نە کۆلکە مەلایەکی دەست نەکەوت، پەنای بە کوێخا «حەمەسور» برد کە «شەمسە»ی کچی بنێرێتەلای «مەلا یۆسۆ» بخوێنی، «مەلا یوسف» ماموستای «وەلید» دەرسی بە «شەمسە»ش ئەووتەوە، ماوەیەکی زۆر بەیەکەوەبوون، تا تەمەنی دڵداری‌یان ڕیشەی دڵیانی لەیەک ئاڵان و پەیمانی خۆشەویستی‌یان مۆرکرد، «مەلا یۆسۆ» هەستی پێ‌ئەکردن و باوکی «وەلیدی»ی ئاگادار کرد، باوکی پێ‌خۆشحاڵ بوو ووتی مەلا...!ئەمە هەموو ئاواتی‌منە کە هەتا ماوم و نەمردوم بەم ئاواتە بگەم، ئەچین و داخوازی «شەمسە»ی بۆ ئەکەین.

داخوازی «شەمسە»ی بۆ کرا، دەست ماچ ئەکرێ و باوکی «شەمسە» ئەڵێت: کوێخا موحەممەد با ئەمساڵ بە دەزگیرانی بیان هێڵینەوە تا لە کوێستان بگەڕێنەوە، هەردوولا بە چاکیان زانی، بەڵام قەدەر چی ڕێک ئەخا، ئەوە کەس نازانێ!!!.

ئەو ساڵە لە (هۆبەتو) لە ناوچەی (دیواندەرە) مانەوە، لە هاتنەوەیاندا بۆ گەرمیان هەردوولا لە چەند جێ‌گەیەکدا نزیک یەک هەڵیانداوە، تا ڕۆژی قەدەر ڕەنگی ناکۆکی ڕشت و لەسەر لەوەڕگە و پووشی دەشت ناخۆشی کەوتە بەینی هەردوولا، لە بەینی دوو هۆز بوو بە لێکدان و یەکتری دانە بەر

تەقە، هەتا شەوێک!؟ هاتنە سەر دەواری ماڵی باوکی «وەلید»، تەقەیان کرد لە دەوارەکانی کوێخا، «حەمە سور» کوڕێکی تری ئەبێ لە «وەلید» منداڵ‌تر ئەکەوێتە بەر تەقە و ئەمرێ، بەمەکۆستی ـ«وەلید»ی قوڕ بەسەر ـ ئەکەوێ، دیسان کوێخا «حەمە سوور» لە تۆڵەی کوڕەکەی دوو پیاو لە هۆزی کوێخا «قادر» ئەکوژێ، ئیتر بەتەواوی ئاگری شەڕ و ئاگری دڵی «وەلید» کڵپە ئەکا و پەرە ئەسێنێ، «وەلید»ی هەژار تەنانەت ناتوانێ لە دووریشەوە «شەمسە» ببینێ.

بە تێ‌گۆنەی «شەمسە» بوو بە مۆمێکی کافووری سپی داگیرسا و دڵێ وەک «وەلی» هەژار بوو بە پەروانەی ئەو، ئەوەتا بە نائومێدی‌یەوە ئەڵێت:

**پەری ڕەش‌ماڵان، پەری ڕەش‌ماڵان**
**دەلیل بچۆ لای پەری ڕەش‌ماڵان**
**لای «شەم»ی بەزمی شادی‌پەروانان**
**پێش‌ڕەوەی پۆلی دیدە قەترانان**

یان ئەڵێت:

**سەر هەر لە سەودای عەشق‌بازی‌یە**
**دڵ هەر نیشانەی تیرئەندازی‌یە**

بەڵام:

**پێم بە داوەوە شەتەک دراوە دڵم پڕ ئێشە جەرگم بڕاوە**

ئەمە بوو ژیان و بەسەرهاتی «وەلی» کە دوای هەوڵێکی زۆر تا بەدەستم هانی، ئەویش چۆن!؟، بەشێک لە «پێشەکی»یەکەی کاک «عوسمان هەورامی» و بەشێکی تری لە «کەشکۆڵ»ی دەسنووسی «نجم‌الدّین‌مەلا»، وە چەند پرسیار لە پیاوانی شارەزا و «وەلی» دۆست.

بۆ بەڵگەی خوێندەواری «وەلی»، ئەم دوو بەیتەی دەری ئەخاکە «وەلی» خوێندەوارێکی باش بووە، وەک ئەڵێت:

**بنیان نەڕوی (تـاق) مـەجموع فـەردم**
**بنویسان وە(شەسـت) دەست ئەو مردم**
**تـــا هـــەرکەس ویـــنۆ مـێڵ و مـەزارم**
**بزانۆ کوشتەی ئـەو «شـەم» ڕوخســارم**

بەم ماناکە: پێش مەرگی وەسیەتی کردووە ئەم دوو بـەیتە لەسـەر کـێلی گۆڕەکەی بنوسن، هەرچەند لەو سەردەمەدا لەکێل نوسین باو نەبووە.

هەروەها «شەم»یش قورئانی خەتم کردووە، «وەلی» لە سـەرەمەرگدا لە وەسیەتەکەیدا ئەڵێت: تۆخوا «شەم» ئاگادار بکەن با بـێتە ژوورسـەرم و بـە دەنگی خۆشی (یاسین)م بخوێنێ، با بـەدەم دەنگـی سـازی ئـەوەوە گـیانم دەرچێ، وەک ئەڵێت:

**وەســـیەتم ئـیدەن شـای شـەم ڕوخســاران**
**بــــەی وە بــاڵینم چـــون بـــەینەتداران...**
**بێ خۆف و ئەندیش جە کەس نەکەی شەرم**
**هــورداره پــەردەی حــیجابت بــە نــەرم**
**نـــەپۆشی جـــەبین «شـــەمس» خـــاوەری**
**بــەو وە زانـــوودا چـــون ئــاسمان پـەری**
**بـــــــنیشه وە بـــــان بــــاڵینم وە نـــــاز**
**بــــوانـــە ســــورەی (یــاسین) وە ئــاواز**

«وەلی» زۆر شارەزایی لە زمانی (فارسی)دا هەبووە، ئەمەش بە بـۆنەی تەواو کردنی (گوڵستان)ی «سـەعدی» کـە لای مـەلایۆسف خـۆندبوی. لە

هونراوەیەکدا کە وەڵامی «ڕەنجوری» ئەداتەوە ناوی زۆر لە شاعیرەکانی پێش ئەبات، وەک: (جامی، مەسنەوی، عیسمەت، شەوکەت، و...) چەندێ‌تر. لە جێگەیەکی‌تر ڕەنجوری لە «مەرسیە»کەیدا، واتە: لە شیوەنەکەی بۆ مەرگی «وەلی»، «وەلی» بە (میرزا وەلی) ناو ئەباو ئەڵێت:

**حەیفا حەیف، ئەی چەرخ چەواشەی چەبگەرد**

**«میرزای» نادرەی ڕۆی ئەییامش بەرد**

لە سەردەمی پێش، یەکێ خوێندەوار بوبێ لە نەخوێندەوار جیایان ئەکردەوە و پێیان ووتوە (میرزا)، جا لێرەش دەری ئەخا، کە وەلی «میرزا وەلی» بووە.

یان ئەڵێن لە سەرەتاوە «وەلی» هەر نەبووە، ئەم چەند هۆنراوەیە هی هونەری نەمر «پیرەمێرد» بووە، لەبەر ئەوە کە لە هۆنراوەی دڵداریدا نەی ویستووە خۆی ئاشکرا بکا، ئەم (وەلی دێوانە)یە بۆخۆی داناوە.

وەک ئەزانین هۆنراوە مڵکی هونەرە، جا هەیە خاوەنی مڵکێکی زۆربێ بەڵام تاپۆکەی بخاتە سەر یەکێکی‌تر، کەوابوو ئێمە هەر خاوەن تاپۆ، بە خاوەن مڵک دابنێین، یان هونەرێکی وەک «پیرەمێرد» کە پێ‌نووسی کوردی لە خۆشی ئەو زوبانی گرت، ئێستا بۆچی لەم هۆنراوە دڵڕفێنە سوتێنەرانە خۆی کەنار بگرێ.

من ئەڵێم: نەخێر ئەمە هەرگیز لە «پیرەمێرد» ناوەشێتەوە وە یان «پیرەمێرد» بۆچی ئەم هۆنراوانەی بە شێوەی هەورامی ووتوە، ئیتر نازانم بڕیاری چی بۆ ئەدەن وایە یان نە...؟

**ڕازی**

# فەڵەک هەتاکەی

فەڵەک هەتاکەی، فەڵەک هەتاکەی...

فەڵەک لە دەرگات سزام هەتاکەی...

تاکەی پەشێوحاڵ ڕەنگم زەرد، وەک بەی

تاکەی ناڵەناڵ بناڵم چون نەی

تاکەی لەش بەبار لە خاکا کەوتوو

تاکەی دەرد و ئێش بمکا بە مردوو

تاکەی فریشتەم چاوی لە خەو بێ

تاکەی ڕۆژی ڕوون لەلای من، شەو بێ

تاکەی بڵێسەی گیانم، لە تاو بێ

تاکەی خۆراکم خوێن و زوخاو بێ

تاکەی ئاگری دەروونم گەش بێ

تاکەی لە شادی دڵم بێبەش بێ

تاکەی سکاڵام لە ڕۆژگاربێ

تاکەی دەربەدەر جێگەم «کۆسار»بێ

تـــــاکـــــەی ژیـــانم لە یـــاران جـــیابێ

تـــاکـــەی ڕووم لەکـــەی ڕەشـــیی تـیابێ

تـــاکـــەی مـەینەتکێش دەردم کـــاریبێ

تـــــاکـــــەی ژیـــــانم بـــێقەراری بـــێ

تـــاکـــەی بـە حـەسرەت دڵـم تـاسا بـێ

تـــاکـــەی شـەشدەرم ڕێگـەی گـیرا بـێ

تـــاکـــەی «دێـــوانـە»ت لە کـۆساران بـێ

تـــاکـــەی فـــرمێسکم تـــاوی بـاران بـێ

تـــاکـــەی بـــێ مـروەت، بـزانـە حـالم...

تـــــاکـــــەی بـــە جـــەفای تـــۆوە بـــنالم

یـــــا لەم بـــــەندەدا تـــۆ ڕزگـــارم کـــە

یـــا بـــە یـــەکـــجاری شـێت و هـارم کـە

***

## هەرمن خەمبارم

یـاران خـەمبارم، یـاران خـەمبارم[1]

هەرمن سەرشێواو، هەرمن خەمبارم

هـــەرمن چـــاوەڕوان، نـیە قـەرارم

هـەرمن نـاساز و چـەوتە ڕۆژگـارم

هەرمن دڵ بەخوێن دیـدە پـڕئاووم

هـــەرمن لە خـــوێنی زامـان تـلاوم

١. سەردێرەکەی لە بابی: هەرمن خەمبارم، «یاران خەمبارم»ە.

هەرمن بە شیری خـەم گـۆشکراوم
هەرمن خاوەن دەرد هەم دڵشکاوم
هەرمن هیجرانبار من کـەمدەماخم
هەرمن خانەخویێی پەژارە و داخم
هەرمن ئاوارەی کـوچەی شـارانـم
هــەرمن بــەدبەختی ڕۆژگــارانـم
هــەرمن دڵتــەنگم لێــوم بــەبارە
هەرمن بە خەدەنگ جەرگم بوو پارە
هـەرمن پـەرێشان، هـەرمن زوێـرم
هــەرمن بــریندار پـێکراوی تـیرم
هــەرمن چـارەشوم ڕەشـە ئـیقباڵم
هەرمن لە جەوری گـەردون ئـەناڵم
هەرمن نـاو جـەرگم بـە گـڕ بـریانە
هــەرمن هـەناسەم چـلەی زسـتانە
هــەرمن فـرمێسکم تـاوی بـارانـە
هــەرمن نــاڵینم دەردی هـیجرانـە
هەرمن خەم بە خەم ئۆگری کردوم
هەرمن سەر تا پێم خەم وونی کردوم
هەر خاکی مـنە بـە خـەم شـێلراوە
هــەرمن بــەرانــم ئــاواتـوسراوە

**هەرمن «دێوانە»ی دووکەوتووی «شەم»م**

**هەرمن ڕەنجەڕۆ من هـاوڕێ کـەمم**

**(¹خەمە خۆراکم، خەمە بۆ بـەرگم**

**خـــەمە نـەشتەری داوە لە جـەرگم**

**ئاخ و داخ و ئـێش، هـاوار و ڕۆڕۆ**

**ئەمانە هـەموی لای مـن بـوونە کـۆ**

**شوکرم بە کردەت کارسازی کـاران**

**ئـــەی ئـــاگـــاداری دڵـەی بـیماران**

**بـــە فـــەرمانی تـۆ دروست کـراوم**

**بـــۆچی لەقـــاپی تـــۆ دەرکـــراوم**

**بێ لە خەم و دەرد هیچت نەدا پـێم**

**ڕوویەکی خـێرت نـەکـردەوە لێـم**

**دڵـم لەتلەتـە بـە دەرد و مـەینەت**

**نەخۆشیم بینی نـەچەشتم لەززەت**

**ئەوەندەم خەفەت کۆکرد لەنـاو دڵ**

**وەختە گیان دەرچێ بمنێنە ناو گڵ)**

***

١. لەم شیعرەوە من بە هی «وەلی» تێ ناگەم، بەڵام تێکەڵ بە شیعرەکان «وەلی» بوە و بە هی «وەلی» ناسراوە منیش ناچار وەرم گێڕاوە و وەکو خۆی نوسیمەوە.

# یاران لە جەرگم

یـــاران لە جــەرگم، یــاران لە جــەرگم[1]

«شەم» شـێوەی تـیری داوە لە جــەرگم

کــەوتمە گـــیانەڵڵا دواکـــاتی مــەرگم

مـــەمشۆن و کـفن مـەکـەن بـە بـەرگم

تکـــایە مـەیشۆن جـێی بـرینی لەش

با لە زام بـتکێ تکـەی خـوێنی گـەش

شـــەهید بـــێ کـفن و بـێ شتن چـاکـە

هەرکەس شەهیدبێ بـێ گـەرد و پـاکـە

بــــەڵام وەســـــیەتم ئـــەمەیە یـــاران

دوور لە ووڵاتـــــــم وام لە دیــــاران

تـۆخوا بـا گـۆڕم لە ڕێی خـێڵان بـێ

لەسەر ڕێگای «شەم» شاخی گێڵان بێ

کــێلێکی بـــەرز بـەقەد بـاڵای «شـەم»

لەسەر گـڵکۆم بـێ بـەبێ زیـاد و کـەم

تـــاقی بـــەوێنەی تـــاقی بـــرۆی ئـەو

سوژدەگای دڵبـێ بـە ڕۆژ و بـە شـەو

لە ڕوی بــــنوسن هــــۆنراوەکـــانم

کە بـە تـیری «شـەم» دەرچـووە گـیانم

---

١. ئەم شیعرە لەسەر شێوە ئەسلیەکەی وەرگێڕاوە.

تــا هــەرکەسێ دی کــێل و مــەزارم
بــزانــێ کــوشتەی دەســتی دڵــدارم
چــونکە «شـەم» گـۆنا تـاتاری چـینە
لە دەشت بـــێزارە چـــیا نشـــینە
ڕۆژێ هـــەڵکـــەوێ لە ڕێگـــوزارێ
ڕێگـــەی بـنێتە ســەر گـۆڕم جـارێ
بــزانــێ کــوشتەی ئــاخ و داخی دڵ
ئـێش و ئــازاری بــردەوە تـۆی گـڵ

***

## دڵ بریانێ بێ

دڵبـــریانێ بـــێ، دڵبــریانێ بــێ
دەروونپــڕدەرد بـێ، بـا حـاڵزانـێ بـێ
تۆ مەینەتکێش بی، ئەویش بە خەم بـێ
تۆ وەک «پەروانە»، ئەو وێنەی «شەم» بێ
بــۆ کـــەسێ دڵت لە خـــەم کــەیل بـێ
تۆ «مەجنون»ی وێـڵ، ئەویش «لەیل» بێ
داخت بــۆ یـەکـێ ئـەویش داخدار بـێ
خـەمخۆر و دڵسـۆز هـەتاسەر یـار بـێ
خـــۆشە دڵــداری لە هــەردوسەر بــێ
نـەک تـۆ بسـوتێی ئـەو بـێخەبەر بـێ

نەک بەوێنەی «شەم» ترسی خوای نەبێ

لە پـەروانـەکـەی هـیچ ئـاگـای نـەبێ

دەربـــەستی ئـێش و ئـازاری نـەبێ

ئـــاگـــای لە نـاڵە و هـاواری نـەبێ

دڵـــە، دەخـــیلە دســتم بـە دامـان

بێسوود مـەکـێشە جـەفای بـێ سـامان

***

## ئەی نائومێدی

ئـــەی نـــائومێدی، ئـــەی نـائومێدی

ئـــەی ڕەنـــجەڕۆیی، ئـەی نـائومێدی

یاران ڕۆژڕەشـی وەک مـن کـوا؟ کـێ دی؟

دەردی مـــــەجنونم هـــــێناوەتە دی

شـاخ و هـەرد و چـۆڵ گـەڕام سـەرانسـەر

لە تـــوناوتونی «بـــابا» چـــوومەدەر

هەردی (نجد) گەڕام جێی «قەیس»ی داماو

وێـنەی «پـەروانـە»ی پـەڕوباڵ سـوتاو

هـاتمە ئـەو شـوێنەی مـاوام قـیبلەم بـوو

ئەو جێگەی کە زووا جێوڕێی «شەم»بـوو

چـــیمدی؟ هـەواری چـۆڵ و وێـرانـە

بـــایەقوش تـــیایا کـــردبوی لانـــە

نــــەمابو دەنگـــــی هــــەیاهوی جــاران
بـــێخشپەو ســامناک وێــنەی مــوغاران
پــــــرسیم بــــایەقوش هــاودەردی دەردم
دۆســـتی هــاوڕاز و هــەناسەی ســەردم
مــن «پــروانــە»کــەی وێــڵ و «دێـوانـە»م
جــێگـیری «قـەیس»ی ڕیسـوای زەمـانەم
پــــەرپۆ ســــوتاو لەخــــێڵ جــێماوم
تــیری عــەشقی «شـەم» لە جـەرگی داوم
بــــایەقوش وتــــی شــێتی ســەوداســەر
ڕیســــوای زەمــانە، وێــڵی دەشت و دەر
خــێل پــێچایەوە چــووۆ بــۆ (لەیـلاخ)
بۆ من جێی چۆڵ ما، بۆ تـۆش ئـاخ و داخ
لە شــــومی چـــــارەم مــــن وامــاومەوە
بــــــە نــــائومێدی بــــەسەودامـــــەوە
ئــاخ! چــیبکەم لەدەس چــەوتی زەمـانە
ڕوو لە هــــەرکوێکــــەم بــۆتە وێـرانــە

***

## ڕوناکیم لەسەر

ڕونــــاکــــیم لەســـەر، ڕونــاکــیم لەســەر
هــەرمن نــیمسەودای عــە شـقیتۆم لەسـەر

وێـــنەی مـــن زۆرە، لەت و پـەت جگـەر
لە عـــەشقی بـــاڵات وێـــڵن، دەربـــەدەر
هـــەرلایەک ئـــەچم هـــەرباسی تـــۆیە
هـــەرکەس ئـــەبینم هـــەراســـی تـــۆیە
لەنـاو جـوانـاندا جـوانـیی تـۆ تـاکـە!
شـاهان حـەسرەتمەند گـەدا خـەمناکـە
چـەند مـوسوڵمانت تـۆ بـە (نـارت) کـوشت
بـە نـیگات خـوێنی چـەن دڵـدارت ڕشت
چەند مورشید شێت بوون، چەند سۆفیان وێـڵ
دڵبـەستەی عـەشقت لاوانـی گشت خـێڵ
«فـەقێ»ت ڕیســواکـرد، «مـەلا» سـەرگەردان
«شـێخ» دەربـەدەر بـوو، «دەروێش» لە هـەردان
وێـــنەی پـــەروانـە و بـولبوڵ شـەیداتـن
دڵانـــی پـــڕدەرد هـــەر لە ســەوداتــن
تـــۆ وێـــنەی «تـەرسا» جـوان و نـازەنین
پـیری «سـەنعان»ی لائـەدەی لە دیـن
ئـەوڕۆژە جـوانـیت خـوا کـردی پـەیدا
سـۆفی و دەروێش و مـورشید، بـوون شـەیدا
لە چـــاووت هـەیداد لە بـاڵات هـەیڕۆ!
سـەرسام! سـەرگەردان!، عـالەم لە تـاو تـۆ

له شـــاران هـــاوار، له خـــێڵان غـــەوغا
هـــەرکەس ئـــەبینم خـــەمناکـــەو شـــەیدا
گـــەر «فـــەرهاد» و «قـــەیس» بـــزانـــن خـــەبەر
دووبـــــــاره له خـــــاک ســـــەردێننەدەر
دێـــــــن بـــــــه هـــــەیاهووی قـــــیامەتەوه
بـــــــبینن جـــــــوانـــــــی لەم قـــــامەتەوه!
هـــەتا زیـــندووبم شـــای «شـــەم» جـــەبینم...
شـــــێت و خـــــەمبارم دڵ مـــــاتەمینم

***

## ڕوناکی باوان

ڕونـــــاکـــی بـــاوان، ڕونـــاکـــی بـــاوان
سەرزەمین به شـەوق ڕونـاکـیت! ئـاوان!
بـــــالآت نـــــەمامی نـــەوتوڵی ســـاڵان
ســـــارای گـــــوڵستان (جـــنّةالمأویٰ)ن
پـــــرچت پـــارێزەی پـــەخشانی کـــاوان
ئـــەگـــریجەت بـــاڵی «مـــراوی» ئـــاوان
یـــــا وەک چـــــنورەن له ســـــەرکڵاوان
هـــــەردێن و ئـــەچن له دەوری چـــاوان
چاوت وەک چاوی «ئاسک»ی سەرئاوان
گـــۆنات «گـــوڵخونچه»ی تـازه کـراوان

سینەت بە «لیمۆ»ی گوڵبەدەم ئاوان
بۆنخۆشن بە بۆی «شەوبۆ»ی شەتاوان
خاڵت «سۆسەن»ی بەر خۆرەتاوان
من بۆ ئەوخاڵە (تەرە)م لە باوان
نەمامی هەڵچوو نازداری عەشرەت
دیدە بەخومار جوانی گوڵڕومەت
کەس نیە وەک من بکێشێ نازت
منم هەڵگری ڕاز و نیازت
وێڵم، ئەگەڕێم لە دووت ڕۆژ و شەو
حەرامم کردوە لە دووچاوم، خەو
لەوساوە تیرت لە دڵم داوە
چۆڵ و وێرانەت بە من کرد ئاوە
شەووڕۆژ لەگەڵ بەختم دەعوایە
بۆیە جێم لەسەر لوتکەی «چیا»یە
فیدای چاووت بم چاوڕەشی چاوگەش!!!
بەزەیی‌یەکت بێ بە منی چارەڕەش

***

## ئاخ! بۆ (خەسرەوخان)

ئاخ بۆ خەسرەوخان، ئاخ بۆ خەسرەوخان
ئاخ بۆ «خەسرەوخان» خانی خانەدان
دارای گەنج و ماڵ خاوەن سپا و سان

ئازا و چاونەترس شێری ڕووی مەیدان
دەست و دڵخاوێن بەڕەحم و ویـژدان
ئـەو بـەخشەندەیە بـە دڵـی نـەرمی
بەشەوق و زەوق و بە هـەستی گـەرمی
بـۆ ڕاوو شکـار بـێ بـۆ ئـەم کـێوە
ئەم «کـێوە»ی مـنی «دێـوانـە»ی پـێوە
بـەچاو بـبینێ جـەستەی پـەشێوم
وەک جـانەوەری نـاو دەشت و کـێوم
بەزەیی‌یەکـی بـێ بـە دیـدەی نـم‌ناک
بە ئێشی زامم، بـە لاشـەی سـەرخـاک
بـە ڕوت‌وقـوتیم، تـەنیایی، چـۆڵم!!!
بـە سـەرینی بـەرد، گـیانی نـاو خـۆڵم
بـە بـێ‌کـەسی‌یو سـەرگەردانـیم‌دا
بـە زامی سـەختی بـێ ئـامانیم‌دا
بـە ئـاه و نـاڵەی نـیوەشەوم‌دا
بـە ڕاپـەڕینی شـیرین‌خەوم‌دا
بـە نـامورادی و ڕەشـی بـەختم‌دا
بـە نـاڵەی گـەرم و زامـی سـەختم‌دا
بە شێواوی بەخت، شـوومی چـارەم‌دا
بـە تکـەی خـوێنی جـەرگی پـارەم دا

بــە کـــڵپەی گـڕی ئـاگـری جـەستەم
بە گـیانی کـفتی پـڕ ئـێش و خـەستەم
دڵـــی بـــێتەجۆش کـــە دی ئـەحواڵـم
بـــــپرسێ کـــوشتەی کـــام نـــەونەهاڵم
تـــێ‌بگا کـــە مـــن لێـرە چـی ئـەکـەم
بووم بە «پەروانە»ی گڕی گۆنای «شەم»
سەرمایەی شادیم کێ زەوتـی‌کرد لێـم
«پەری»ی‌کام‌جێ‌بوو‌هیچی‌نەهێشت‌پێم
«وەلی» بە خەیاڵ (نۆفەل)[1] یاد ئـەکـا
خۆی بە ڕوناکی «شەم»ی شـاد ئـەکـا
خـــۆزگە خـەیاڵم بـەڕاست ئـەگـەڕێ
دەلیـــــــــلێکی وام بـــــــــهاتایە ڕێ
یا بە گەنج و ماڵ یـا بـە زۆری‌چـەنگ
شـادی‌کردایـە «پـەروانـە»ی دڵ‌تـەنگ
بـەخشـەندە بـایە بـەوێنەی (حـاتەم)[2]
«شەم» بستێنێ بۆم، من شادکا بە«شەم»
بـــەڵام، ئـــاخ!، چـی‌بکەم لە ڕۆژگـارم
دڵســــــۆزێ نـــــیە بـــێ بـــە هــاوارم
مەگەر (یەزدان)ی خـاوەن دەسـەڵات
لەم بـــەندە ســـەختە ڕزگـــارم بکـــات

---

١. (نۆفەل) ئەو پیاوە بو کاتێ ویستی (لەیل) بۆ (مەجنون) بستێنێ.
٢. (حاتەم) ئەو بەخشەندەیە کە ناودارە و ناوی هەر نامرێ.

ئــەینا ئــەو (بــەند)ەی وابــە پــێمەوە
هــەتاکــو مــردن پــێی ئــەتلێمەوە

***

## داخ هاتە سەر داخ

داخ هــاتە ســەر داخ، داخ هــاتە ســەر داخ
ئێش هــاتە ســەر ئــێش داخ هــاتە ســەر داخ
لە داخــی دووری شــای بــوڵەند دەمــاخ
من گەرمای (گەرمێن) ئەو فێنکی (لەیلاخ)
ئــــاخ و داخ و دەرد لە لام مــــایەوە
مــــاڵی بــــاوانی نــــەگــــەڕایــەوە
ئــەمساڵ نــەوبەهار لای مــن (دەیــجور)ە
چــــونکە چــــاوانــــی لە چــاوم دورە
ئــــەوا لە کــــۆیستان لەوپــەڕی خــۆشی
من مــام لە (گــەرمیان) بــۆ زوخــاو نــۆشی
ئــــەترسم بــــازی بــــازاڕی گــــەردون
لە گــەردولولی چــەرخــی دونــیای دوون
«مــــەجنون» بــە ئــازار ســەری نــایەوە
خــــەم بــۆ «فــەرهاد»ی هــەژار مــایەوە
یــەک یــەک یــارانــی لە ژیــن بــێزار کــرد
ڕۆژی ڕونــاکیــان بــەشەوی تــار کــرد

بە جۆرێ عەشقی «مەجنون» تاوی سەند
بناغەی ژینی لەبێخا هەڵکەند
ئەترسم بەختی ناپوختم وابێ
میراتی ئەوان بۆ من جێ مابێ
«شەم»م بە هاودەم (ابن‌سلام)[1] بێ
منیش تا ماوم ئازار سزام‌بێ
خوایە ئەو بارە نەنێیتە شانم
گەر هاتوو ڕوی‌دا زوو دەرچێ گیانم
مەرگ چاکترە بۆ من لەو ژیانە
گۆڕ زۆر خۆشترە بۆم لەو زیندانە

***

## ڕیسوای زەمانەم

ڕیسوای زەمانەم، ڕیسوای زەمانەم
«قەیسی» سەر شێواو سەحرای وێرانەم
«پەروانە»ی پەشێو ڕیسوای زەمانەم
بێزار لە ماڵم، شێت و «دێوانە»م
وێنەی بایەقوش شەو لە وێرانەم
جەرگ‌بڕاوی تەشەر و تانەم
بێزار لە بینین دیدەی یارانم
پاسەوانی دێر سەر دیارانم

---

١. (ابن‌سلام) ئەو کەسەیە کە «لەیل» شووی پێ کرد.

لە کــەس تــەوەللا لە دۆست بــێزارم
بــە شــەوو بــە ڕۆژ لە یــادی یــارم
عەسای خەم لەدەس مەی، خەم ئەنۆشم
سەرگەردانی خەم شڕەی خـەم پـۆشم
ســزاو ستەمکێش بـەختی ڕەش بینم
«فـەرهاد»ی کـۆکـەن مـوغار نشـینم
شـەش‌دەری بـەختم ڕێی لێ گـیراوە
خــەم‌بار و دڵتــەنگ جـەرگم بـڕاوە
چەوت و لار و گێژ چەرخی چەپگەردم
دەردم گــــرانــە دوور لە هــاودەردم
وەک ســــەربزوتی قــەراخ ئــاگــرم
بە سروەی شـەماڵ زیـاتر گـڕ ئـەگـرم
دڵ پـــڕ ئــازاری زەمــانەی دوونــم
پشــــتم شکــاوە کــۆم و زەبــوونم
شــەو دیــدە بــێ‌خەو ڕۆژ بــێ‌قەرارم
گــیراوی جـەوری چـەوتی ڕۆژگـارم
بــێزار لە ژیــنم ڕازیــم بــە مــەرگم
بە نـەشتەری خـەم کـونکونە جـەرگم
چاو لەڕێی خێڵان ڕیسوای هـۆزانـم
بــە ئــاگـری عـەشق سـوتاوە گـیانم

هـــاوڕێی جـــانەوەر لە بـــیابانم
«قەیس»ی تانەکێش، چـاو بـە گـریانم
«پەروانە»ی شەوقی «شەم» ڕوخسارێکم
پـێکراوی تـیری مـوژەی یـارێکم
«حاتەم»ێکـی «تـایی» قـاتە لە بـەختم
بەزەییەکـی بـێ بـە دەردی سـەختم
وەک «نۆفل» کێیە بێ بـۆ ئـەم جـێیە
بـبینێ «قـەیس»ی دووهـەمی لێیـە
خەیاڵ چەندخۆشە بـۆ نـەوەی ئـادەم
خوا بـێناردایـە یـەکـێ وەک حـاتەم
شـــادی کـــردایـــە دڵـەی خـــەمبارم
بـە ئـاواتـی خـۆم بە وەسـڵی یـارم
خـــوایـــە مـــەگـەر تـۆ بگـەیتە فـریام
ئـــەینا تـــا مـــردن ئـاوارە و تـــەنیام

***

## ئەستێرەی بەیان

ئـەستێرەی بـەیان، ئـەستێرەی بـەیان
ئـەستێرەکـەیڕۆژ هـەڵدێی دەمبـەیان
جوان و پرشنگدار پێش لە خـۆرهەڵات
تـــوخوا نـەتدیوە قـیبلەی دوورووڵات

خـــۆ تــۆ لە زومـــرەی بــەختدارانــی
جــێگای تــەماشای گشت نــازدارانــی
تــۆ زۆر ئــەوەستی ڕوبەڕوی پـاکـان
تەماشات ئەکـەن گشت شـەرەفناکـان
هـــەمو ڕۆژێ ڕوی پـــاکـــیان ئــەبینی
بـــەهرە لە شـــێوەی چـاکـیان ئـەستێنی
چـــــاوت وا لە ڕوی «تــــەتار»انـــەوە[1]
لە شــــەوق و جـــوانـــی نـــازدارانـــەوە
هــــەتا ڕۆژ لە «کـــەل» ســـەردێنێتەدەر
تــــــۆ بـــاخەوانـــی لە بـــاخی دوڵــبەر
تــوخوا ئــەبینی نــووری چـاوی مـن
«شەم»؟، شادی دڵـەی پڕ زوخـاوی مـن
ئــەو کــە لە زومـــرەی جـەبین سـافانە
«شـــەم»م شـــەوچرای عـێلی «جـافانە»
گـەردی سـەرڕێتبم ئـەستێرەی بـەیان
ئەو وەک تۆ شیرین، تۆ وێنەی ئەو جوان
چۆن نـەتکرد سـەیری ئـەو فـریشتەیە
ســـەیری ئـــەو شـــۆخە لەلات عـەیبەیە

***

---

١. «تەتار» واتە: ئاسکی تەتار، کە ئەو ئاسکە زۆر ناسراوە بە چاو جوانی.

# وێڵی دشتودەر

وێڵی دەشت و دەر، وێـڵی دەشت و دەر
ئەی هەوای خـۆشی کـوێستانان لەسـەر
ئاسکی سرک و جوان پێش‌پۆلی ئاسکان
گورج و عاشق‌کوژ، ئـەبرۆ وەک کـەوان
بە عەتری پەرچەم «چیا»ت پڕ کـردوون
بە نیگا و لەنجەت دنـیات سـڕ کـردوون
نـــازانـــم ڕاوچـــی؟ یـــا نـێچیری؟ تـۆ
چـــەندەها ڕاوچـــی کـەوتنە گـێژی تـۆ
بــەرزە ئــەستێرەی گـەشی بـەختی تـۆ
کار ئاسکی گورجی هەردی سەختی تـۆ
ڕوو ئــەستێرەی‌گەش بـرۆ وەک کـەوان
بـــرژانگت تـــیری جـــەرگی عـــاشقان
بـــــە لەنــــجە و لاری دڵ فـــــڕێنەوە
بــە ڕەوت و نــیگای گــیان ئـەستێنەوە
بــە پــرچـــی قـەف‌قەف گـرژ و لولەوە
بــە بـالای هـەڵچووی وەک نـەوتوڵەوە
بەو کـرێشمە و نـاز، لەنـجە و ڕەوتـەوە
بە ڕووی وەک ڕۆژ و زوڵـفی شـەوتەوە
بـــــە لێـــــوی ئـــــاڵی وەک یـــاقوتەوە
بـــــە ڕیـــــزەخاڵی تـــاک و جـــوتەووە

بــە گــەردنی بــەرز شـوشەی سـافەوە
بە زوڵـفی بـۆنخۆش مـیسکی نـافەوە
بـــە کـــــرژ و تـــوند و ڕق و قـــینەوە
بـــە ڕەوتـــــی نـــەرم و ســـڵەمینەوە
قیبلەم کـێت نـەکـرد تـۆ بـە «دێـوانـە»؟
کــێ بــۆتۆ نـەبووە ڕیسـوای زەمـانە؟

***

## بەردی هەواران[1]

بــەردی هــەواران، بــەردی هـەواران
ڕەش داگــیرساوی کــۆچی هـەواران
مــەلول و دڵتـەنگ جـێماوی یـاران
وەک مــن هــاوبەشی دەرد و پـەژاران
تۆ بەردی کوێبووی؟ لە کام هەواران؟
بــۆ کــێ ڕەشپـۆشی؟ وێـڵی دیـاران
خـــەمباری عـەشقی کـام نـەونەهاڵی؟
بێڕەنگ و ماتی کام ڕوومـەت ئـاڵی؟
تۆ بەداخی کێ ڕەشبووی سووتاوی؟
لە کـام هــەوار و هـۆزێ جـێماوی؟
ڕاســتم پــێ بـڵێ بـۆ کـێ داخداری؟
ئازیزت کـێیە؟ وابـۆی خـەمباری!!!؟

---

١. مەبەست لەم بـەردە ڕەشـەبەردی سـێ گـوچکەیە (کـوانـوو)، کـە مـەنجەڵی ئەخەنەسەر، جاکە خێڵ کۆچی کرد ئەو بەردانە بەجێ ئەهێڵن.

«بەرد»ووتی:بەدبەختکوێلەیدەردوخەم
«پەروانە»ی پەشێو دوورکەوتوو لە «شەم»
مــەگــەر نــازانــی بــینابیت لێــڵە
ئێرە جێ و شوێنی گوزەرگای خێڵە!!!؟
ئێرە شــینگەکــەی خــێڵی جــافان بــوو
جێی ناز و عیشوەی گەردن سافان بوو
هەوارگەی ڕەوگــەی عــێڵی «مــورادی»
شــوێنیان ئــێرەبوو پــڕشەوق و شــادی
من شوێنی «شەم»ی شای پەروانان بووم
پێشەنگی جوانی ناو ڕەشماڵان بــووم
پــاییز کــۆچی خــێڵ دێــنە خــوارەوە
تــەشریف دێــننەوە شــوێنی پــارەوە
مــنیش بــە شــەوقی «شــەم»ە ســوتاوم
گــەشی گــۆنای ئــەو دووره لە چــاوم
هەروای ووت «بەرد»ی ڕەشی هەواران
من لەو خراپــتر بــێدەنگ بــووم یــاران
زانــیم بــۆ «شــەم»ە ئــەویش داخدارە
داخ و خـــەمناکـــی بــۆ دووری یــارە
منیش لە ئێشی شای «شەم» ڕوخساران
ئاوا چــوومە ڕەنگ «بــەرد»ی هــەواران

«بەرد»ی جێماوی هەواران منم
خەم خۆری هەموو خەمباران منم

***

## شەوبێدارانم

شەوبێدارانم شەوبێدارانم
هاودەمی نالەی شەوبێدارانم
بومی وێرانەی گشت دیارانم
ئاخ و ئۆفکێشی ڕۆژگارانم
«پەروانە»ی سووتاو پەشێوحاڵ منم
وەک قەقنەس سووتاو کۆی زوخاڵ منم
ڕاوچی بێ نەچیر لە هەردان منم
پێشێلکراوی دڵبەردان منم
گیرۆدەی مەینەت پڕجەفا منم
تاساوی چەرخی بێوەفا منم
سەرکردەی پۆلی مەینەتبار منم
سەرلێ شێواوو گەستەی مار منم
مەئیوسی بینین دیدەی یار منم
مەجنونی وێڵی سەرکۆسار منم
بێ دۆست و هاوەڵ بێ خەمخوار منم
بێ ئەحواڵپرس و بێ دڵدار منم

کـەسێ دیـار نـیە خـزم و یـارانـم
بـبینێ کـڵپەی ئـاگـری گـیانم
دەردێ دای بـەمن چـەوتی ڕۆژگـار
مـەگـەر دابـێتیە مـەجنونی هـەزار
بـۆ ئـێشی جـەرگم لەت لەت و چـاکـم
چاوەڕوانـی لوتـف «یـەزدان»ی پـاکـم

***

## پەری ڕەش‌ماڵان

پـەری ڕەش‌مـاڵان، پـەری ڕەش‌مـاڵان
دەلیـل بـچۆ لای پـەری ڕەش‌مـاڵان
لای «شەم»ی بـەزمی شـەوی پـەروانـان
پـێش‌ڕەوی پـۆلی دیـدە قـەترانـان
ئاسکی چۆڵ و هەرد لە «چیا» پەروەردە
چەن دڵـی وەک مـن بـۆت پـڕ لە دەردە
ئـەڵێت گـوێت‌داوە بـە قسـەی ئـەغیار
مـن بـەو پـەیمانە کـە کـردم ئـیقرار
سـەر هـەر لە سـەودای عـەشق‌بازی‌یە
دڵ هـەر نـیشانەی تـیرئەندازی‌یـە
پـێم بـە «داو»ەوە شـەتەک دراوە
دڵ پـڕ لە ئـێشە جـەرگم بـڕاوە

هـــەتا ئـەمنێنە دووتـۆی گـۆڕی تـەنگ
شەرتە لە ئـێشت هـەرگیز نـەکـەم دەنگ

***

## فیدای ناووت بم

فیدای نـاووت بـم، فـیدای نـاووت بـم
تـــۆ نـاووت چـیە؟ فـیدای نـاووت بـم
بـــاڵاگـــەردانـی هـەردوو چـاووت بـم
شـــانەی داهـــێنەر زوڵـفی خـاوت بـم
من «پەروانـە»ی وێـڵ هـەردی وێـرانـەم
«قەیس»ی سەرشێواو ڕیسـوای زەمـانەم
شـــــەوان هـــەتا ڕۆژ هـــاوڕازم خـــەمە
گـــــیانلەبەرانـــــی کـــــێوم هـــاودەمە
دەربەدەر مـاووم بـێ خـۆراک و جـێم
پـــەژارە و مـــەینەت بـــوونەتە هـــاوڕێم
لەش بـــــە ئـــــازار و گـــڕ لە دەرونـــم
لە هـــەردی لەبـــەس ئـــاوارەی تـــوونم
لەوکاتەوە مـن لە «شـەم» دوورکـەوتووم
دڵ پـڕ لە پشکـۆم سـاتێ نـەسرەوتووم
هـــــەر گـــیانلەبەرێ لە شـــێوەی یـــارە
هــــــاوڕازی دڵـــــەو دەوای ئـــــازارە

مــن زەوقــم لەگــەڵ دەنگــی ئـاسکانە
ســوکنایيم ســەيری چــاوی ئــەوانـە
دوور لە چــاوی یــار بــەوان دڵشـادم
تـــا ڕۆژی گـــەردون ئــەدا مــورادم
تــوخوا ئــەو ئـاسکە گـرتوتە بـە داو...
شـــێوەی ئـــازیزم ئــەنوێنێ تــەواو
تــیری نــیگای ئــەو لە دڵ کـار ئـەکـا
چـاوێ لە چـاوی چـاوبەخومار ئـەکـا
فیدات بم سەدجار ڕاوچی دەشت و دەر
بـــیبەخشە، «داو»ی لە مــل بــێنەدەر
ئـــازادی بکـــە تــوخوا لە «داو»ت
یــاخوا هــەتا هــەی بــەرزبێ نــاوت
ئەو ئـاسکە جـوانـە ئـازادکـەی لە «داو»
لە ژیـــنا نــەنگی نــابینی بــە چــاو

❊❊❊

## جوانی پێچاوە

جـوانـی پـێچاوە، جـوانـی پـێچاوە
جوانـی سـەرپێچی سـەری پـێچاوە
زوڵف و ئەگـریجەی ڕێک داهـێناوە
بــەسەر ڕوومــەتا پــەخشان کـراوە

سینەی دەرکەووت یەخەی کراوە
لیمۆی وەک تورەی تەیمور نەخشاوە
پەرچەمی چینچین تازە قرتاوە
خۆر هاتوەتەدەر لە ڕۆژئاواوە
ئەبرۆی شمشێری تازە سوراوە
بە چاوی وێنەی ئاسکی خەتاوە
برژانگەکانی تیژە وەک نێزە
هەر ئەڵێی سوپای شاهی «پەروێز»ە

***

## بۆچی زویر بێ...؟

بۆچی زویر بێ، بۆچی زویر بێ...
دڵ لە ئازار و ئێشت زویر بێ...
دڵم گەردانەی یاقووتی ئاڵ بێ..
لەتۆ زویر بێ بە کۆی زوخاڵبێ
چاوێ هەمودەم بالآت نەبینێ...
بە فرمێسک خۆڵی ژێر پێت نەڕشێنێ...
ئەوچاوە چاوی ئاسکی «چیا» بێ..
لە «خوا»م داوایە کە نابینابێ
سەرێ شەووڕۆژ ئاگای نەبێ لێت...
نێوچاوان نەخا لە خاکی ژێر پێت...

ئەگەر ئەو سەرە سەری «قارون» بێ..
لە «خوا»م داوایە سەرەونگون بێ
دەستێ لە داوای دۆعا نەبێ بۆت...
لەسەر سنگ نەبێ کاتی هات و چۆت...
ئەگەر ئەودەستە دەستی «ڕۆستەم» بێ..
لە «خوا»م داوایە ئیفلیج و کەم بێ
پێیەک هاتوچۆی ڕێگای تۆ نەکا...
لەبەر ماڵتانا نەیەت و نەڕوا...
ئەو پێیە گەر پێی پاشا و ئەمیر بێ..
لە «خوا»م داوایە بەستەی زەنجیر بێ
گیانە دەستی من بەدامانی تۆ
گیانی شیرینم، بەقوربانی تۆ

***

## یارم لە خەودا

یارم لە خەودا، یارم لە خەودا
ئەمشەو پەشێو دیم، یارم لە خەودا
ڕەنگزەرد و بێدەنگ پڕخەم لە خەودا
کز و لێوبەبار دیم «شەم» لە خەودا
کە بە زەلیلی دیم «شەم» لە خەودا
کەوتمە ناڵە لە شیرین خەودا

جۆرێ شێواو بوو دیم بە خەو ئەمشەو
بــە ســەرگەردانــی ڕاپـەڕیم لە خـەو
کــاتێ ڕاپـــەڕیم، کـــە زانـــیم خـەوە
مەستی (ئەلەست) بووم لەو نیوە شەوە

***

## دڵدارم «شەم» بێ

دڵـدارم «شـەم» بـێ، دڵـدارم «شـەم» بـێ
بۆ هەرکەس وەک تۆ کە ناوی «شـەم» بـێ
سەرگۆنای وێـنەی مـانگی چـواردەم بـێ
نــاسک و نــازدار لە چـــەشنی کـەم بـێ
پـرچـی ڕەش‌مـار و عـەتر پـەرچـەم بـێ
دڵــی «پـــەروانـە»ی بـۆ پـڕ لە خـەم بـێ

***

بۆ هەرکەس باڵای وەک «سەوڵ»ی ساف بێ
پـــەرچـــەم پـــڕگوڵاو یـا مـوشکناف بـێ
پێش‌ڕەوەی جوانی گشت عێڵی جاف بێ
ئـــەبێ تـــۆئاسا وا بـــێ‌ئینساف بـــێ
وەک تۆ لێـو شـیرین یـا خـونچەدەم بـێ
دڵــی «پـــەروانـــە»ی بـــۆ پـــڕلەخەم بـێ

***

بۆ هەرکەس وەک تۆ ئەبرۆ کەوان بێ
زوڵف و خاڵ سێوەنگ برۆ قەتران بێ
وا بێ‌فرسەت و دادە و ئامان بێ
وەکو تۆ فیتنەی ئاخرزەمان بێ
بێ‌شەرت و بەڵێن، ئارەزو کەم بێ
دڵی «پەروانە»ی بۆ پڕ لەخەم بێ

***

بۆ هەرکەس وەک تۆ ڕوی پڕ لە نوور بێ
سینە و گەردنی وێنەی بلوور بێ
فریشتەی ئاسمان نەسڵی لە حوور بێ
بێ‌ترس و بێ‌باک لەڕێی خوا دوور بێ
وەک تۆ دەلیلی دوری ڕێگەم بێ
دڵی «پەروانە»ی بۆ پڕ لەخەم بێ

***

بۆ هەرکەس وەک تۆ لیمۆی کاڵی بێ
سینگی «سەدەف» و لێوی ئاڵی بێ
گەردنی بەرزی وەک «غەزاڵ»ی بێ
ناسک و نازدار و چواردە ساڵی بێ
وەک تۆ دڵداری لەناو دڵ کەم بێ
دڵی «پەروانە»ی بۆ پڕ لەخەم بێ

***

بۆ هەرکەس وەک تۆ بەجوانی «شاز» بێ
چاو پڕ لەسورمە بە عیشوە و ناز بێ
هەزاران دڵی ئاواتەخواز بێ
ناشی و نەزانحاڵ وا بێمەجاز بێ
شەوقی پڕنووری بەوێنەی «شەم» بێ
دڵی «پەروانە»ی بۆ پڕ لەخەم بێ

***

## کاتی مردنم

کاتی مردنم، کاتی مردنم
ئەمانەت فەرزە وادەی مردنم
گەیشتە وادەی وەسیەت کردنم
لەکاتی سەختی گیانسپاردنم
توخوا بلێنە شای «شەم» جەبینم
کاتی ڕۆحکێشان بێتە سەرینم
بەبێ ترس و باک شەرم نەکا لەکەس
پەردەی ڕووپۆشی دادرێ بەدەس
نەپۆشێ تیشکی گۆنای خاوەری
بابزانن ئاسمان دایبەزاند پەری
دانیشێ لەپاڵ سەرینم بە ناز
بخوێنێ سورەی «یاسین» بە ئاواز

بــە زوبــانی شـیرین شـەکـرڕازەوە
بـە دەنگ و سـەدای خـۆش‌ئاوازەوە
ڕوو بـــە ئــاوەنگی پــڕ گــوڵاوەوە
بــە گــۆنای ئـاڵ و زوڵـفی خـاوەوە
فـرمێسک لە چـاوی ئـەو نـازدارەوە
بـتکێتە سـەر ڕووی ئـەم بـێ‌چارەوە
با تێـر سەیربکەم لە چـاوی جـوانـی
گــــیانم دەربــچێ بــێتە قــوربانی
با تـێر گـوێ‌بگرم لە دەنگـی سـازی
لە سورەی شەریف!!، خۆشی ئاوازی
گیانکێش بێت بە سەد ئێش و ژانەوە
هـەرگیز نـیم بـەتەنگ گـیانکێشانەوە
گــەر بــەم‌جۆرەبێ ئــارامـی گـیانم
بـــەخوا بـــە ئـــاسان دەردێ ڕەوانـم
ئای کەچەند خـۆشە ژیـان و عـومرم
لە خاک‌وپای‌تۆ گیان‌دەرچــێ، بـمرم
گــەر بــەقەد کـێوێ گـوناهم هـەبێ
بەهەشت جێگامە، «خوا» ئەم‌بەخشێ

***

# گیانە خەوم‌بێ

گــیانە خــەوم‌بێ، گــیانە خــەوم‌بێ
ئەگــەر بــەبێ‌تۆ یــەک ئـان خــەوم‌بێ
ناڵــەی بــێ‌ئەمان کــاری شــەوم بــێ...
قەت ئۆقرە نەگــرم دایــم ڕەوم بــێ...
بــێ‌دیدەنی تــۆ گــەر پــەژارەم بــێ...
پــەژارەو تــرسی بــەرقەنارەم بــێ...
گــەر ســاتێ یــادت لە دڵــم دەربــێ...
دڵم لەت و پەت نوکی خەنجەر بێ...
ئەگەر بێ‌تۆ کــەس، بکــەم بــە یــارم...
ســـــرەوتم نــەبێ لەبــەر ئــازارم...
گەر ساتێ یــادت دەرچــێ لە یــادم...
نــوقمی یــادنەبێ دڵــی نــاشادم...
دەروونم لەتی تێخی ئــەڵماس بــێ...
زوبانم لەت‌لەت وێنەی پەڵاس بــێ...
قەسەم بە دیدە و بــە بــاڵای شــەنگت
ئەگــەر بــۆ ســاتێ نــەبیسم دەنگت...
مــــەلی ڕەوانــم لە «تــەن» بــێزارە
دونـــیا لە چــاوم تــاریک و تــارە

***

# بەکۆی زوخاڵ بێ

بەکۆێ زوخاڵ بێ، بەکۆی زوخاڵ بێ
ماڵی باوانت بەکۆی زوخاڵ بێ
دایکت نابینا زوبانی لاڵ بێ
باوک مردووبی خۆشیت لێ تاڵ بێ
سوێندم بەو خوایە ماڵ بێ تەنافە
گەر لەگەڵ مندا مەیلت خیلافە...
دوور لە باڵای خۆت باوانت چۆڵ بێ
خزمانت سەرشێت کەڵپۆس لە کۆڵ بێ
باوان وێران بی، کەست نەمێنێ
بایەقوش لەسەر ماڵتان بخوێنێ
خێڵی خوێشانت توشی تالان بن
بە پەند و عیبرەت کورد و گۆڕان بن
ئەوەش بزانی کە دۆعای منە...
سەرلێشێواوی و خۆشیت لێ وونە
تۆ جێگەت سازە کوێستان نشینی
کەی دەربەستی ئێش منی خەمینی
لە کوێستانی خۆش بەدەماخەوە
لە چاوگەی سازگار لای «لەیلاخ»ەوە
لە کوێ ئەبینی «دێوانە»ی ناشاد
لەو جێیە منت کوا؟ دێتەوە یاد

# کاتی مەرگمە

کـــاتی مـــەرگمە، کـــاتی مـــەرگمە
وادەم بـــەسەرچـــوو، کـــاتی مـــەرگمە
بـــەو ئـــێشە ســـەختەی لەنـــاو جـــەرگمە
خـــاک و گـــڵ و گـــۆڕ، جـــل و بـــەرگمە
لە گـــیان کـــێشانا هـــەر چـــاوەڕوانـــم...
کـــە تـــەشریف بـــێنێ کـــاتی نـــەمانم!
کاتێ کـــە گـــیانکێش دێ بـــۆ ڕەوانـــم...
مـــۆڵەتم نـــادا، دەســـتێنێ گـــیانم
«شەم»ی ڕومەت شەم بـێتە ســەرینم...
ئـــەوکاتە دەرچـــێ ڕۆحـــی شـــیرینم
بـــڕژێتە ســـەرم فـــرمێسکی چـــاوی
کـــفنەکـــەم بـــدروێ بـــەزوڵفی خـــاوی
بڵێم بە «شـەم»ی شـاهی چـاومەستان
لەگـــەڵ تـــەرممدا بـــێتە گـــۆڕستان
بـــەدەستی نـــاسک شـــۆخی دوڵبەرم...
بـــەردی «ئـــەلحەد»م بـــنێ ســـەر ســـەرم
کـــە بـــەردت دانـــا خـــاکـــی مـــەزارم...
بکـــە بـــەسەرما، شـــۆخی نـــازدارم
گـــیانەکـــەم هـــاتو ئـــەوەت بـــۆکـــردم
بـــەوێنەی دڵـــدار تـــۆ بـــەڕێت کـــردم

شەرتە هەتاکوو ڕۆژەکەی «ئـەلەست»

من دۆعاگۆی تۆم شۆخی دیدە مەست

***

## سەگی دەرگای یار

سەگی دەرگای یار، سەگی دەرگای یـار

سـەگـی پـاسەوان پـێش‌قاپی دڵـدار

هاوڕێ و هـاوڕازی گشت کـاتی نـازدار

خاکی پـێت دەرمـان چـاوی پـڕ ئـازار

خـۆ تـۆ لە زومـرەی وەفـادارانـی

دڵسـۆز و خـەمخۆر دەردەدارانـی

سـەگـی خـانەزای بـاوانـی یـاری

ئـارامـی دڵـی دەوای ئـازاری

ئـەزانـم قـیبلەم بـەدەستی جـوانـی...

پـەروەردەی کـردوی بـۆ پـاسەوانـی

خۆ ئەگەر هات و قـەستی سـەرت کـا...

ئـازارت بـدا، دەربـەدەرت کـا...

قـەت بـڕوام نـیە تـۆیی وەفـادار

لە ئـاستانەی یـار بـبی دەس‌بـەردار

هـۆی چـیە ئـێستا هـاودەردی دەردان

دورکەوتوی «شەم»ی کـەوتویتە هـەردان

ئـــێستا دورکـــەوتوی لە قـــاپی دڵـــدار
پێم‌بڵێ بەدبەخت، چۆن ئـەگـری قـەرار
وەک مـــن هـــەردەمە وای لە هـــەردێکا
هـــــەرشەو مـــیوانـــی لە بـــن بـــەردێکا
سـەگ وتـی: کـەوتەی زەمـانەی بـێ‌بار
«پەروانە»ی «شەم»ی ڕومەت پرشنگ‌دار
بــــۆ لێـــــڵاویتە بــــینایت کــــوێرە
بـــە حـــەزی‌خۆمە؟ یـــا دەستی زۆرە؟
بۆ شاری «بەغدا» چووە بـاوکی «شـەم»
مـــن پـــارێزگاری مـــاڵاتتان ئـــەکـــەم
هـــــاتومە ئــــێرە بــــە حــوسن و ڕەزا
تا «گـورگ» مـێگەل، پـاک نـەکـا غـەزا
بۆ مـەڕ فـرۆشتن چـووە بـاوکی «شـەم»
«پـەروانـە»ی خـەم‌گین وایـە بـەبێ کـەم
ئـــەگـــینا بـــەبێ ســـووچ و بـــەهانە
بـــۆچی ئـــەگـــەڕێم ئـەم بـیابانە
«وەلی» بــــەقوربان مــــەڕومالتان بـــێ
بـــالاگــەردانـــی مـــاڵ و حـــاڵتان بـێ

***

# نازداری جافان

نــازداری جــافان، نــازداری جــافان

نــازداری بــێعەیب تــایەفەی جــافان

پێش‌ڕەوەی پـۆلی ئـاسکی سـەرشاخان

گــوڵی ســەرکردەی گـوڵی نـاو بـاخان

ئــاسکی کـەژاڵ، چـاو لە دەشت و دەر

توند و سرک و گورج لە سێبەر سڵ کـەر

لە تــیرەی تــەتار شـۆخی شـیرین‌خاڵ

خاوەن خەت و خاڵ خەتا و خوتەن ماڵ

جــێگەت سـازگار لە بـەرزی کـوێستان

ڕاوچــــیانت ویــڵ دڵــیان پــڕلە ژان

ئەبرۆ وەک کەوان چـالاک و چـاوڕەش

لە دەست و تیرت ئەتکێ خوێنی گـەش

گــۆنە و لاجــانگت هــەتاوی قـەدپاڵ

بــاڵندەی تــوندڕەو شــمقاڕی تـیژباڵ

چــرای ڕوونـاکـی هـەموو ڕەش‌مـاڵان

نــاوت ویــردی لێــو خـاوەن ئـیقباڵان

بــە کــوڵمی گــەشی پـڕ لە نــوورەوە...

کـێت نـەدابـەدەم ئـاگـری سـوورەوە؟

بــەو بــرۆ ڕەشــە تــۆخ و قــەترانـە...

خـــانەی چـــەن دڵت کــردە وێــرانــە

بەو چاوەگەشەی سورمە تێ کراوە...
موژەت لە خوێنی کێ وەرنەداوە؟
بەو نیونیگای ناز، بەو لەنجەولارە...
ئاخر جەرگی کێت نەکردووە پارە؟
بە ڕەوتی نەرم و لەنجەو هاتووچوو...
بڵێ کێت نەکرد بە باوک مردوو؟
بە گەردەنی بەرز شوشەتەزەوە...
بە پرچی لول و باڵای بەرزەوە...
توخوا دڵی کێت تۆ نەستاندەوە؟
خانەی ژیانت نەڕوخاندەوە؟
من لە داخی تۆ جەرگم بوو توێ‌توێ
هەر داخە دێتە سەر داخانی نوێ

***

## لە «شەم» جیام من

لە «شەم» جیام من، لە «شەم» جیام من
«پەروانە»ی پەشێو لە «شەم» جیام من
مەجنونی وێڵی دەشت و سارام من
مەئیوسم لە «شەم» چارە سیام من
شێت و سەرگەردان لە خێڵ جێ‌ماوم
وێڵ و دەربەدەر عەقڵ شێواوم

بــێ کـەس و تـەنیا، بـێ‌هاودەم مـاوم
لە گــێژی دەریــای خــەما خــنکاوم
ڕەش‌تـــر لە بــەردی هــەواران مــنم
دەربــــەدەرماوی دیــــاران مــــنم
کەوتووی توناوتون توونی «تـەبەس»م
جەفای بەبێ‌سوود ڕەنـج بـە عـەبەسم
دەرد و ئـێش وەک کـێو بـارە لە شـانم
بــۆدیدەنی «شـەم» هـەر چـاوەڕوانـم
هــاودەمی وەحشــی و جـانەوەرانـم
ئــەشکەنجە و ئــازار بــارە لە شــانم
چــاوەڕوانـی ڕێی یـاری کـوێستانم
دڵ پـڕ لە حـەسرەت چـاو بـەگـریانم
بــێگانەی قـەوم و کـەس و کـارم مـن
نــائومید لە «شــەم» پــڕ ئــازارم مـن
تــا کــاتێ ئــەمرم دڵمـەحزونم مـن
گڕی عـیشقی «شـەم» لە دەرونـم مـن

***

## ناسک، نازی «شەم»

ناسک، نازی «شەم»،ناسک، نازی «شـەم»
ناسک، لەنجە و لار غەمزە و نازی «شەم»

ناسک، برۆیڕەش قودرەتسازی «شەم»
ناسک، باڵای بەرز چاوی بازی «شەم»
ناسک، دو لێوی بە هەنگوێنی «شەم»
ناسک و شیرین پێکەنینی «شەم»
ناسک، گەردنی شوشەی بەرزی «شەم»
ناسک، سەرسینگی سەدەفتەرزی «شەم»
ناسک، پەرچەم و زوڵفیخاوی «شەم»
ناسک، گوفت و گۆی پڕگوڵاوی «شەم»
ناسک، ددانی گەوهەردانەی «شەم»
ناسک، نەخشی خاڵ لوتەوانەی «شەم»
ناسک، مەچەکی بێوێنەیی «شەم»
ناسک، سەرپەنجەی بێخەنەیی «شەم»
ناسک، سرکەیێ جوانپێچراوی «شەم»
ناسک و نازدار برۆ و چاوی «شەم»
ناسک، چەناکەی چاڵ و جوانی «شەم»
ناسک، دووپرچی بانیشانی «شەم»
ناسک، دووتیشکی خوابەندی «شەم»
ناسک، ناسکیی کەمەربەندی «شەم»
ناسک، دیدەی مەست، بەخوماری «شەم»
ناسک، باڵای بەرز، وەک چناری «شەم»

نــاسک، لامــلی وێــنەی بەفری «شـەم»
ناسک، ئەگریجەی پڕ لە عـەتری «شـەم»
نــاسک، بــەرامــی عـەنبەرباری «شـەم»
ناسک، پۆزیساف شـوشەکـاری «شـەم»
ناسک، سەرکوڵمی گوڵی سووری «شـەم»
نـاسک، نـاوچاوی پـڕ لە نـووری «شـەم»
نــاسک، قــامەتی خــەرامــانی «شــەم»
نـــاسک، نــاسکی بــێئامانی «شــەم»
ئــەمە هــەر «شــەم»بــوو بــەمناووداوە
هــەزار «پــەروانــە»ی بە گـڕ سـووتاوە
لە پەنای نـوری شـای نـەجەف مـاڵ بێ
نـــاحەزی بـــاڵای زوبـانی لاڵ بــێ

***

## بە خاڵی تۆوە

بـــە خـــاڵی تـــۆوە، بــە خــاڵی تــۆوە
نــوری لیــقای حــەق بــە خــاڵی تــۆوە
تیشکی «شـەم» بـە شـەوق جـەماڵی تـۆوە
دارایـــــان بـــەداخ کـــەماڵی تـــۆوە
«لەیــلا» کــەنیزەک «شــیرین» کــارەکـەر
«زلــێخا» کــڕیار بــە زێـڕ سـەربەسەر

«هـــومەیلا»ی پـــەری «بـــەڵقیسا»ی بـاڵدار
«گوڵشاد» «گوڵئەندان» «عوزرا گوڵعوزار»
یـــەک بـــە یـــەک شـــێتی بـــەژن و بـاڵاتن
بــــاڵای نـــــەونەمام ســــــەوڵی ئـــاڵاتن
دڵارامــــــی دڵ «ســــەمەن» بـــۆی پـــەری
«مەنیجە»ی «بیژەن» «زوهرە» و «موشتەری»
«خـــەرامـــان» شـــێتی شـــێوەی جـــوانـــتە
بــــانووان خـــــەریک ســـەنا و خـــوانـــتە
حـــۆری بـــەهەشتی فـــریشتەی ڕوگـــەش
ســـەناخوانـــی تـــۆن لە زەمـین تـا عـەرش
گـــــوڵ لە گـــوڵزاران بـــە داخـــی تـــۆوەن
داخداران بــــــەداخ دەمــــــاخی تــــۆوەن
چـــەند پـــەروانـــە هـەن بـە شـاخ و کـۆوە
هـــــەموو حـــــەیرانـــن بـــە شـــەوقی تـــۆوە
مـــنی «پـــەروانـــە»ش داخ لە دڵـــی تـــۆم
شـــــێواوی گـــۆنای وێـــنەی گـــوڵی تـــۆم
بـــەسەرگەردتبم «شـــەم»ی ســـپی شـــەم
ســــــەرگەردانـــیتۆم دەرون پــڕ لە خـــەم
بـــە بـــاخی لیـــمۆی کـــاڵت شـــادم کـــە
یـــــا خــــــۆ بـــــمکۆژە یـــا ئـــازادم کـــە

ئـەگـەر لەسـەر لێـو وونـنـەکـەی خـەندە
هـــیچێ کـــەمناوێ لەو خـــوداوەنـــدە

***

## هەوری ڕەشی خەم

هەوری ڕەشی خەم، هەوری ڕەشی خەم
تـۆ ڕەشت پـۆشی مـنیش بـاری خـەم
دەبـا هــەردوکمان بـە دڵـی پـڕ مـاتەم
من لە زەمین «ئـاه»، تـۆ ئـاسمان «تـەم»
تۆ بـارانـیڕوون مـن فـرمێسکی گـەش
بـا داچــڵەکــێ گــەردونی سـەرکەش
تـــۆ ئـــاویچاوت بــە شــین و زاری
بــــڕێژەرەخوار تـــاوی بـــەهاری
مـــن بـــە نـــاڵەناڵ لە ئـێشی دەردم
بـێتەدەر کــزەی هــەناسەی ســەردم
بـــا تـــوفانی خـــۆر زەمـــین بـــماڵێ
هــەڵکــێشی لەبـن سـنگی ڕەشمـاڵێ
خــێڵان لە تــەمی ئــاهی هـەردوکمان
داگـــــەڕێنەوە بـــێنەوە گــــەرمیان
تــا کــۆچی خــێڵی جــافی مــورادی
پــەیدابــن لەگـەڵ «شـەم»م بـە شـادی

بــا هــەردی گــەرمیان بــەوان بــەفەڕ بــێ
وەک بــەهاری نــوێ پــاراوو تــەڕبێ
توخوا هەوری ڕەش با هەردو وەک یەک
مــن لەســەر زەمــین تــۆ لەڕوی فــەلەک
هەردوکمان بە جووت بــا بگــرین بــەتاو
پــەیدا کــەین تــەم و هــەیەجانی ئــاو
ئــەگــەر بــەم جــۆرە لافــاو هــەڵبستێ
خــــێڵ کــــوێستانان ئــیتر نــاوەستێ
کــــۆچی ڕەشمــاڵان دێــنەوە دامــان
شــاد ئــەبین بــەسەیر نــەوتوڵ نــەمامان
مــنیش شــادئەبم بــەسەیری «شــەم»م
دڵــــم خــۆش ئــەبێ نــامێنێ غــەمم
هــاتوو بــە بــاڵای نــەمامی بــووم شــاد...
جــــەوری گــەردونم نــامێنێ لە یــاد

***

## هامسەران ناوم

هــامسەران نــاوم، هــامسەران نــاوم
مــــن بــە «دێــوانــە» نــراوە نــاوم
ڕیســـوای زەمــانە کــەیلی زوخــاوم
ســاتێ نــەوەستا فــرمێسکی چــاوم

کـــاتێ لە داوێـن دایکـم بـووم پـەیدا
نـــاوم لێ‌نـــرا «دێـــوانـــە» و شـــەیدا
چاو بە فرمێسک و دەرون پـڕداخ بـوم
خەم‌ناک دڵشکاو هەم بـێ‌دەماخ بـوم
ئـەبینم ئـەی «شـەم» رەقـیب لە گـەڵتا
گیانم وەک ئـاگـر ئـەچزێ بـە نـەوتا
هەرچەند سزاکێش باری مـەینەت بـم
بەم جۆرەش ڕازیم سەت ناڕەحەت بم
هــــــەرکە ئــــەبینم لە ڕاگـــــوزەردا
«شـــەم» شـــێوە، ئـاگـر لە دڵ بـەرئەدا
کـــزەی بـــڵێسەی بـــۆ گـــەردون ئـەبا
ئـــەبم بـــە خـــەڵوز یـا تـۆزی دەم بـا
«پـــەروانـــە» ئـــاسا ئـەبم بـە زوخـاڵ
ئەسوتێم بە شەوق «شەم»ی گـۆنا ئـاڵ
ئـــــاگـــــری گـــیانم ئـــاوا ئـــەسوتێ
تا قرچەی جەرگم ئـەگـاتە بـەر گـوێ
لەپێشا «قەیس»ی دەشت و کێوان بووم
شێت و دەربـەدەر بـار لە لێـوان بـووم
ئێستا «دێـوانـە»م پـەڕ و بـاڵ سـووتاو
وێڵ و دەربەدەر کۆست کەوتوو دامـاو

یاران بەگری ڕوی «شەم» سووتاوم
چۆن ئەکەن عیلاج جەرگی قرچاووم
شێت ئەوکەسەیە دڵدا بە خەیاڵ
بسووتێ ببێ بە مشتێ زوخاڵ

***

## یاران بۆ تارە...؟

یاران بۆ تارە؟ یاران بۆ تارە؟
ئەمساڵ نەوبەهار لە چاوم تارە
ژیان و خۆشیم وەک ژەهری مارە
دونیا لە چاوم (وادیالقَهار)ە
هەمووکەس لە کات جوانی نەوبەهار
شادە بە بۆنی گوڵان لە گوڵزار
من نەبێ، ئەمساڵ شادیم ناشاد بوو
نائومید دڵتەنگ ڕەنگم بەرباد بوو
«بولبوڵ» شاد بەگوڵ، من دڵ توێتوێ بوم
ڕەنجەڕۆی جوانی بەهاری نوێ بووم
ئەمساڵ نەوبەهار خۆشتر لە ساڵان
بووژاوەتەوە سەوزە و گوڵاڵان
دەشت و قەتپاڵ و سارا و هەواران
گوڵ دایپۆشیوە جوانتر لە جاران

گـــــولزار لە چـــاوی مـــن درِک و داڵـــە
سـەوزە و گـــوڵ و گـــیا لام بـێ جـەماڵە
سـەیری جـــوانـــی کـەم ئـاخم زیـادکا
«لالە» لە دەرون داخـــــــــم زیـــــــادکا
شکـــۆفەی تـــازە شـــێوەی «شـەم» دێـنێ
لە نـــــــاخا دڵـــم دائـــەچڵەکـــێنێ
بـــەهاری ئـــاوا...، دۆســـتم لێ دووربـێ
چـــاوم بـــە گـــریەی جـیایی سـوور بـێ
خـۆزگە سـەت خـۆزگە بـە بـەهاری پـارا
هـــەموو بـــەیانیان ئـــەمدی بـــاڵای یـــار
بـــــەهاری ئـــــەمساڵ گـــــیری ئـــازارم
ئـــــاواتـــــەخوازی دیـــــدەنی یـــــارم

***

## هەرمن خەمبارم

هـــەرمن خـــەمبارم، هـــەرمن خـەمبارم
هـــەرمن خـــەمگینم، هـەرمن خـەمبارم
هـەرمن «پـەروانـە»ی «شـەم»ی گـڕدارم
هـــەرمن ئـــاوارەی ڕێی ڕەش و تـارم
هـــــەرمن ئـــەستێرەی بـــەختم گـــیراوە
هـــەرمن لە شـــەشلا ڕێگـــەم تـــەنراوە

هەرمن وەک «مریخ» جیام لە ڕوناکی
هەرمن بەدناویم پچڕی بە تاکی
هەرمن پەرێشان ئێش و ئازارم
هەرمن گیرۆدەی دەس ڕۆژگارم
هەرمن ئاڵۆز و شێواوە بەختم
هەرمن سزاکێش ئازاری سەختم
هەرمن لە گێژی خەما خنکاوم
هەرمن وەک «مەجنون» دەربەدەر ماوم
هەرمن لە بەختم ڕاستی نەماوە
هەرمن وەک «فەرهاد» جەرگم بڕاوە
هەرمن فریشتەی شادیم نوستووە
هەرمن وێنەی «قەیس» «سارا»م گرتووە
هەرمن لە پێنج فەرز وەستاوم بێزار
هەرمن وەک «سەنعان» بەستومە «زنار»
هەرمن بە تانە جەرگم بڕاوە
هەرمن لە دونیا خۆشیم نەماوە
هەرمن «پەروانە»ی پەرێشانحاڵم
هەرمن دەرناچێ «شەم» لە خەیاڵم
هەرمن لە ئاسمان ئەستێرە وونبوم
هەرمن شەمئاین لە «شەم» دور کەوتوم

هەرمن سەرزەوی گەڕام لە دوای «شەم»
هەرمن بەدناویم زڕا لە عالەم
هەرمن بۆ «شەم»م دڵ پڕئازارم
هەی یاران عیلاج، بێن بە هاوارم

***

## هەی «شەم»ی شەوان

هەی «شەم»ی شەوان، هەی «شەم»ی شەوان
هەی «شەم»ی بەشەوق چڵچرای شەوان
هەی ژیانی‌من، هەی ڕۆحی ڕەوان
هەی گڵێنەیی دیدەی بێ‌خەوان
هەی ئاسکی سەرکەل لە سێبەر سڵ کەر
هەی هەوای سازی کوێستانان لەسەر
هەی عەنبەرین‌خاڵ سۆسەنی کڵاف
هەی ڕوناکایی ڕەش‌ماڵانی جاف
هەی من «پەروانە»ی پەڕسوتاوی تۆ
هەی من گیرۆدەی زوڵفی خاوی تۆ
تۆ جارێ نایەی بۆ سەروەختی من
گوێ نادەی بە «ئاه» زامی سەختی من
ناپرسیت ئاخۆ من بۆتۆ چۆنم
بێباکی لە تین قرچەی دەرونم

هـــەوای کـــوێستانت وابـــۆ بـــووەوە
حـــەیفت کـــرد مـــنت لە بـــیر چـــووەوە
بـێمروەتیت کـرد هـەی «شـەم» دەربـارەم
مـــن بـــۆتۆ «قـــەیس»ی ســـیا ســـتارەم
وادەی مـــن و تـــۆ دیـــوانـــی (خـــوا) بـێ
مـــەگـــەر ئـــەورۆژە دادم ڕەوابـــێ
«شـەم»ی شـەم ڕوومـەت تـۆ بـەسەلامەت
سکـــاڵای دڵـــم کـــەوتە قـــیامەت

***

## ئۆف، بریندارە

ئـــۆف بـــریندارە، ئـــوف بـــریندارە
دوو تـــۆی جـــەرگی مـن او بـریندارە
هـــەر دیـــدەی مـــنە لە خـــەو بێزارە
هـــەر زووخـــی دڵـە، دێ وەک فـوارە
دووکـــەڵی ئـــاهم دونـــیای گـــرتەبەر
بـە سـۆزی مـنە سـووتا دەشت و دەر
هـــەر ئـــاهی مـــنە دەنگـــی دایـەوە...
لە گـــوێی عـــالەمدا زرنگـــایەوە
گـــریانی مـــنە بـــەرد بـەدەنگ دێـــنێ
بـــێئاگـــا لە خـــەو ڕائـــەچڵەکـێنێ

هەر شینی منە بە ڕۆژ و بە شەو...
هەر «هۆلەیل»مە وەک مەجنون بێخەو
هەر منم بە ڕۆژ هەتا ئێوارە
دوورکەوتوی یار، یانەم کۆسارە
هەر داخی منە دەردێ لە دووی ئاخ
ڕەشیکرد «لالە» لە هەردی ئێلاخ
یاران تەدبیرێ نزیکە مەرگم
بە خوێنی دیدەم ڕەنگینە بەرگم

***

## یاران سافێکم

یاران سافێکم، یاران سافێکم
شێت و ئاوارەی گەردن سافێکم
شەیدای جوانی بەرگ شەفافێکم
کوشتەی نیگای ناز کیژەجافێکم

***

گیری دلداری ناز تەتارێکم
کوژراوی موژەی پڕ لە ژارێکم
بێهۆش و مەستی پەری تارێکم
دڵ پڕ لە زوخ و بێقەرارێکم
لەرزەی لەرزانەی ئەحوالّ تافێکم
کوشتەی نیگای ناز کیژە جافێکم

***

ئـــاواره و وێـــڵی جـــام جـــەبینێکم
غـــەمباری غـــەمی دڵ غـــەمگینێکم
زامـــاری دەســـتی زوڵـــف چین‌چینێکم
مـــوبتەلای قـــیبلەی دونـــیا و دیـــنێکم
مـــایل بـــە جـــوانـــێ بـــێ‌ئینسافێکم
کـــوشتەی نـــیگای نـــاز کـــیژە جـــافێکم

***

دڵ‌پـــــڕبرینی دەمـــــی شـــــەستێکم
زار و زەلیـــــلی تـــیغ بـــــەدەستێکم
عـــــەقڵ‌بڕاوی چـــــاوان مـــــەستێکم
جێی تـانەی هـەموو خـاوەن هـەستێکم
ئەی لەیـل مـن «قـەیس»ی بـێ‌خیلافێکم
کـــوشتەی نـــیگای نـــاز کـــیژە جـــافێکم

***

«فـــەرهاد»ی «شـــیرین» شـەکـرڕازێکـم
نـــازداری نـــازی نـــازئەندامـــێکم
دڵ‌بـــەستەی داوی نـــوێ‌پەروازێکـــم
جـــەرگ و دڵ‌پـــارەی چـــنگی بـــازێکم
«پـــەروانـــە»ی پـــێ‌بەست پـرچ‌کڵافێکم
کـــوشتەی نـــیگای نـــاز کـــیژە جـــافێکم

***

دڵ پــــڕ لە کــڵپەی شــەوقی نــورێکم
شــێواوی شــێوەی «شـەم» دەســتورێکم
هـــەراســـانی ئــێش زامـــی دوورێکـــم
«قــەیس»ی ســـەرشێواو نـاومەشهورێکم
«دێــوانــە»ی نـــاودار قـــاف تـا قـافێکم
کـــوشتەی نـــیگای نـــاز کــیژە جـافێکم

***

دەربــــەدەر مــــاوو هـــــەراســــانێکم
گــیرۆدەی تـیشکەی خــورشید سـانێکم
وێـــڵ و قـــەلەندەر «خـــوم» لەشـــانێکم
ووتـــــە گـــــێر و وێـــر بـــێ زوبـــانێکم
ئــــاوارەی ئــاهوی مــــوشکین نــافێکم
کـــوشتەی نـــیگای نـــاز کــیژە جـافێکم

***

## یاران مەجنونم

یـــاران مــەجنونم، یــاران مــەجنونم
«دێوانە» و واریس جێگەی «مـەجنون»م
ئـاخ و ئـۆف و کـێش و زام لە دەروونـم
بــەوێنەی «مـەجنون» ئـاوارەی تـوونم

ئەوڕۆژەی «مەجنون» لە زوخـاونۆشی...
مـەینەت فـەوتانی، کـفنیان پـۆشی
مـن بـوومە واریس لە قەوم و خـوێشی
سـپاردی بـە مـن ئـازار و ئـێشی
نـاڵ و هـاوار و پـەژارە و هـیجران...
ئـاخ و ئـازار و دەروونـی پـرژان
وێـڵ و ئـاوارە، شـێت و سـەوداسـەر
گـیری ئـازاری یـەک لە یـەک زیـاتر
بـێخۆراکـی ڕۆژ، بـێخەوی شـەوان..
هـاوڕێی تـاقمی دوڕەنـدەی کـێوان...
شین و واوەیـلای زامـی پـڕ لە سـوێ...
فـەریاد و نـاڵەی ئـێشی کـۆن و نـوێ...
کـۆیکردبونەوە ئـەمانە یـەکسـەر...
بـەخوێنی جـەرگی، نـووسی لە دەفـتەر
وتـی مـن «مـەجنون» تـۆ «دێـوانـە»بـە
هـاوڕێی دوڕەنـدەی ئـەم کـێوانـە بـە
لەسەر ڕووی زەمـین نـەیتوانـیوە کـەس
جێ و شوێنی «مـەجنون» بـهێنێتە دەس
من حەرامـمکرد لەخـۆم خـورد و خـەو
تا میراتگیربووم چـوومە جـێگەی ئـەو

ئای جەند خەمناکم، ئەی دونیای فانی
خوایە فەناکەی «مەجنونی» سانی
با شوێن و جێگەی نەمێنێ «مەجنون»
کوێریکەرەوە هەواری مەحزون

***

## دڵ بەداخەوە

دڵ بەداخەوە، دڵ بەداخەوە
ئەمشەو خەریکمام، دڵ بەداخەوە
بە داخی «شەم»ی شەوچراخەوە
هەتا نەسیم هات لە لەیلاخەوە
کزەی نەسیمی (روضە)ی (رضوانی)
هێزبەخشیگیانی سەتساڵەی فانی
کزەی هەناسەی (مەسیح) ئاسایی
ئاسودەی ئێشی زامی جیایی
شارەزایی ڕێی شایی «شەم»جەبین
دۆستی «دێوانە»ی تەوەللا لە ژین
عەتری زوڵفانی بۆهێنام ئەمشەو
تەسکین بوو بۆ ئێش، دەرمانیش بۆ خەو
پرسیم نەسیمی دەمی بەیانی...
ئەم بۆنە خۆشەت لەلای «شەم» هانی!!؟

باڵندەی تیژباڵ لە دەشت و سەحرا
تۆی ئاگاداری ئاوارە و تەنیا
چۆن زانیت ئەمشەو من واهیلاکم!؟
گیرۆدەی داخم تەنیاوو تاکم
ئەم بۆنە خۆشە «شەم» پێتی داوە...
پێم بڵێ نەسیم، چۆنت هێناوە؟
وەڵامی داوە نەسیمی بەیان..
وتی: «دێوانە»ی هەرد و بیابان
هەرکاتێ کە «شەم» زوڵف دادێنی
هەناسەم بۆنی بۆلای‌تۆ دێنێ
کەم ئەکا سزا و ئێشی تەنیایی
کز ئەکا کڵپەی ئاگری جیایی
منیش ڕابەری ڕێگەی دڵانم
مەحرەمی ڕازی ڕومەت گوڵانم
هەر کە وەرمگرت بۆم‌هێنای ئەمشەو
زانیم بەسوودە بۆ چاوی بێ‌خەو
دەک بەفیدات‌بم سروەی بەیانی
لە کاتی پێویست دەرمانت هانی
گەر نەگەیشتایە دەرمانی دەردم...
بێ‌کەس و تەنیا ئەمشەو ئەمردم

***

# ئاخ، بریندارە!!!

ئـــاخ! بـــرینداره!، ئـــاخ بـرینداره!
دڵــم بــه تــیری «شــهم» بــرینداره
گـــیانم پـــڕ له ئـێش، دەرد و ئـــازاره
دیـــدەم نـــابینا تـــاریک و تـــاره
بـــه گـــلەیی نـــیم، مـــن له ئـــازارم
سکـــاڵا نـــاکـــەم لەدەس هـــاوارم
سـەرێ هـەمووکات له سـەودات نـەبێ...
له ڕاگـوزەردا گـەردی «پـا»ت نـەبێ...
ســەری وام نـاوێ بـا له «مـل» جـیا بـێ
خــەڵتانی خــوێن و تــاک و تــەنیا بـێ
«پێ»یەک پێ‌ی‌نەکەم هات و چۆ بۆلات...
«گـیان»ێ نـەکـێشێ شـەوورۆژ جـەفات
ئــەو پــێیە مــاری حـەوسەر بـی‌گەزێ
ئـــەو گـیانه بــه زام تــوێ‌توێ داڕزێ
«زمــان»ێ مـەدح و سـەنای تـۆ نـەکـا...
نــەپارێتەوە، دۆعـــای بـــۆ نــەکـا...
ووشک و بێ‌دەنگ‌بێ وێنەی پـەڵاس بـێ
ئـەنجن ئـەنجنی تـێخی ئـەڵماس بـێ
ئـاخ له دووری تـۆ «شـەم»ی ڕونـاک‌ڕوو
«پەروانە»کەی ڕووت هاکـا لەدەس چـوو

# جوانی ژێر ڕەش‌ماڵ

جوانی ژێر ڕەش‌ماڵ، جوانی ژێر ڕەش‌ماڵ

فریشتەی بەهەشت دانیشتوی ڕەش‌ماڵ
«کەو»ی سەرچینە خاوەن خەت و خاڵ
«شەم»ی شەفابەخش شادی پەروانان
سەرکردەی پۆلی دیدەقەترانان
«ئاسک»ی سەرکەل لە تیرەی تەتار
سرک و دیدەمەست سبەینان دیار
گفت و گۆ شیرین پێشڕەوی جوانان
نازداری خێڵان شای نەونەمامان
«ئاسک»ی خۆش‌ڕەو لە هەردی ئێلاخ
چەند ڕاوچیانت ڕاو کردن بەداخ
کارئاسکی گەرمیان پەروەردەی هەردی
شاهینی توندەنگ شۆخی بێ‌گەردی
ئای چۆن تیرێکت داوە لە جەرگم
زامی بەئێشە تا ڕۆژی مەرگم
من ڕاوچی ناشی، تۆ نەچیری چاک
دەرچوی لە جەرگم ئازانە بێباک
مەگەر بەزەیی خواوەند بێتە کوڵ
بولبولی دڵم شاد بکا بە گوڵ

ئــەینا مــن ڕاوچــی دەشتەی مـەینەتم
هـــــەتاكــو مـــردن كــەیلی خــەفەتم

***

## هەرمن ناشادم

هــــەرمن نـــاشادم، هــەرمن نـــاشادم
هــەمووكەس شـادە، هـەرمن نـاشادم
هــەرمن نـــاگــاتە لای «خـــوا» دادم
هــــەرمن بــێبەشی قــاپی مــورادم
هــەرمن ڕێی مـۆری نـەردم گـیراوە
هــەرمن شـەشدەری بـەختم تـەنراوە
هــەرمن نـــاسازە فــەلەك لە بــەختم
هــەرمن گـــیرۆدەی ئـازاری سـەختم
هەرمن چەرخی چەپ لێم چوو بە قینا
هــەرمن ڕۆژڕەشـــم لە ڕووی زەمـینا
هــەرمن ئــەستێرەی شـــادیم گـیراوە
هــەرمن فــریشتەم دەربــەدەر مــاوە
هــەرمن ئــیقباڵ و بـــەختم نـوستووە
هــەرمن ڕێگـــەیی ڕاسـتم وون بـووە
هەرمن چــەوساوی دەسـتی گــەردونم
هەرمن بـادەنۆش جـامی «مـەجنون»م

هەرمن «پەروانە»ی غەمناک و خەستەم
هەرمن گڕی عەشق بەربوەتە جەستەم
هەرمن وەک بولبول یەک فەسڵم وەسڵە
هەرمن سێ فەسڵی عومرم بێ ئەسڵە
هەرمن ڕۆژی ڕوون لە چاوم تارە
هەرمن ژیانم وەک ژەهری تاڵە
هەرمن گیرۆدەی ئێش و ئازارم
هەرمن بە «پاییز» گۆڕا «بەهار»م
هەرمن سزاکێش داخ لەسەر داخم
هەرمن چاوەڕێی ڕێگەی «لەیلاخ»م
هەرمن بۆ دۆستی، ئێلاخ نشینم
وەختە بێتەدەر گیانی شیرینم
تا ئەورۆژە خێڵ ئەگەڕێتەوە
من بە داخەوە سویێم ئەبێتەوە
مەگەر خوداوەند بێتە فریادم
ئەینا تا مردن خاتر ناشادم

***

## دەلیل «شەم»ت دی...؟

دەلیل «شەم»ت دی؟، دەلیل «شەم»ت دی؟
لە «لەیلاخ» هاتووی «شەم»ی جوانت دی؟

ئـــاسکی پــێش ڕەوی ئــاسکانت دی؟
نـــووری بـــینایی دووچـــاوانت دی؟
نــاسک و شــل و مـل بـێ ئـەندازت دی؟
شــۆخی شــیرین‌دەنگ شـەکـرڕازت دی؟
کۆچی خێڵ‌خانەی ئـێڵی (جـاف)ت دی؟
پــێشەنگی جـوانـان سـەوڵی سـافت دی؟
«شـــــەم»ی ســوتێنەر پــەروانــانت دی؟
خـــانی خــانەدان گشت خــانانت دی؟
ئــاسکی مـل بـە خـاڵ لە هـەردانت دی؟
دەرمــــانی ئــێشی پــاک دەردانت دی؟
شـێوە خــەواڵــوو خـــاڵ‌کـوتراوت دی؟
هـــەوێنی عــەتر و هــەم گــوڵاوت دی؟
نــــەمامی ســـاوای نــاو بــاخانت دی؟
تــاکــە جــوانــەکــەی ئـێڵاخانت دی؟
دەوای پـــــــەژارە و غـــــەمی‌دڵت دی؟
پـــەری‌زادەکــەی ســرک و ســڵت دی؟
ئـــێڵ و ڕەش‌مــاڵی کــوێستانانت دی؟
جـێگەی پـیرۆزی «شـەم»ی جـوانت دی؟
«شـــەم»ت نــەدیوە لە جــێگەی پــەنهان؟
بپرسێت ئـەحواڵ «پـەروانـە»ی بـێ‌گـیان؟

نـــەمزانـــی کـــە «شـــەم» پـــەیمانشکێن بـــوو
لەو شـــەرتەی بـــەستمان ئـــەو بـــێبەڵێن بـــوو
ســاردی کـــوێستانان مـــەیلی کـــردوە ســاردا!
لەبـــاتی وەفـــا جـــەفای بـــۆ مـــن نـــارد
کـــەیفی زۆرخـــۆشە دونـــیای بـــەکـــامە
دیـــــارە مـــــەیلی لای (ابـــن سلام)ە
کـــوا عـــەشقی ڕاســـتی دەلیـــلی دیـــاری؟
ئـــەگـــەر تـــۆ ڕاســـتی بـــۆچی بـــێزاری؟
ڕاســـــتم پـــــێبڵێ بـــــا دڵنـــــیا بـــم
«قـــەیس»ئـــاسا وێـــڵی دەشت و چـــیا بـــم

***

## سەر ئەنێمەوە

شـــــــەرتە لە داخت ســـــەرئەنێمەوە
ڕۆیـــــنێ ئـــــەڕۆم نـــــاگـــــەڕێمەوە
ســـەرتاپێم ڕەشکـــەم تـــەرکی دونـــیا کـــەم
پشت لە قەوم و خوێش ڕوو لە سەحراکەم
دڵـــــەی پـــــڕ دەردم پـــــارەپارە کـــــەم
ڕیشـــەی جـــەرگی خـــۆم بـــە قـــەنارە کـــەم
شـــەو تـــا بـــەیانی نـــاڵە و هـــاوار کـــەم
نـــــاحەزی بـــــەدگۆ لەبـــەینا تـــار کـــەم

مــــەگــــەر ئــەوساتە دڵــم بــێ‌خەم‌بێ
گیانم بـە قـوربان دووچـاوی «شـەم» بـێ

***

## هاوار لە ئێشی

هــــاوار لە ئــێشی زامــانم ئــەمشەو
ڕەنگـــینە بـە خـوێن دامـانم ئـەمشەو
کوا حـەکـیم بکـا دەرمـانم ئـەمشەو؟
وەک «ئەیـوب» دیدە گـریانم ئـەمشەو
زامــم بــە ئــێش و کـاری‌یە ئـەمشەو
پــــیشەم نــاڵین و زاری‌یــە ئــەمشەو
یـاران لەدەس‌چـوو حـەیاتم ئـەمشەو
وەک «خضر» تووشی زوڵماتم ئەمشەو
بـێن بــە فــریای گــریانم ئــەمشەو
زیـــــندانــی تــارە ژیــانم ئــەمشەو

***

## یاران نەوبەهار

یــاران نــەوبەهار، یــاران نـەوبەهار
ئەمساڵ لە بەختم «پـاییز»ە «بـەهار»!
هــاتەخوار کــۆچ و کـۆچ‌خانەووبار
لێڵاویم داهـات ئـەم‌دی کـۆچی یـار

خێڵات هاتنەخوار پۆلپۆل لە سەردا
هەموو دابەش بوون لە سارا و هەردا
دیارنیە بار و بارگەی دڵدارم
بەهاری جوان بوو بە ژەهری مارم
هەرگوڵ بە ڕەنگی خۆی ئەنوێنێ
دڵم بە جوانی دائەچڵەکێنێ
هەر داخ و ئێشە دێتە سەر دڵم
لەم بەهارەدا نەپشکووت دڵم
بە بۆی هیچ گوڵێ گەشە ناکا دڵ
ئازار و ئێشە بینینی سومبوڵ
نەرگسی گەش و جوانی هەڵاڵە
لەبەر چاوی من کۆگای زوخاڵە
سۆسەن پێم‌ئەڵێت بۆ لائەدەی لێم؟
جوانی ئازیزت (تەشبیە) بکەپێم
سەیرانی بەهار لام زەهری مارە
ئەڵێن سەیرکە ئەمڕۆ بەهارە
وەختە لە دوری شای شەم جەبینم
بێتەدەرەوە گیانی شیرینم
یاران، هامسەران، حاڵم بێ‌حاڵە
من لە بن بەردان «شەم» لە ڕەش‌ماڵە

***

## لەو نووری «شەم»ە

لەو نووری «شەم»ە، لەو نووری «شـەم»ە
هـەزار مـاشەڵڵا لەو نـووری «شـەم»ە
لەو نووره پاکـەی چـەرخـی چـوارەمـە
له شـەوق پـرشنگ مـانگی چـواردەمـە
له پـێچی هـاتووی ئـەبرۆی کـەوانـی
له ڕێک وەسـتانی بـرژانگـی جـوانـی
له قـەد و بـاڵای ڕێک ڕاوەسـتاوی
له گـۆنای ئـاڵی بـۆنی گـوڵاوی
لەو تـا پـەرچـەمەی دڵـی پـێ گـیره
لەو پـرچـه لوله وێـنەی زەنـجیره
له لێـوی ئـاڵی یـاقوت نـوێنی
له گفت و گـۆی خـۆش شـەکـرشکێنی
له چـەناکـەی خـڕ خـڕیل و چـاڵی
له ژێـر گـەردنی ئـاڵتونی خـاڵی
لەو گـەردنەبەرزه شـوشەی بـادەیه
لەو سـینه سـپی و سـاف و سـادەیه
لەو نـێو نـیگایەی سـەد نـازی پـێیه
لەو لێـوه ئـاڵه لەو گـوارەی گـوێیه
لەو دوو چـاوانـەی کـه پـڕ له نـووره
لەو سـینگه سـپی‌یه وێـنەی کـافوره

لەو نـــەزاکـــەت و ڕەوشت ســـەنگینە
لەو قـــۆڵە پـــڕە پـــەنجە نـــەخشینە
لەو ڕێ ڕۆیشــــتن و ڕەوتـــە نـــاسکە
لەو ســـرک و سـڵێەی چـەشنی ئـاسکە
لەو تـــــووڕەبونە لەو شـــــیرین ڕووە
لەو گـــەردنەبەرزە و لەو ئـــاسک خـووە
جـــوانـــیت «سـنعان»ێ لائـەدا لە دیـن
بـــە کـــەنیزت بێ گـوڵ ئەندامـی «چـین»
چـــەند ســـەردارانت بـۆ ســەرگەردانـن
وەک مـــــن داخ لەدڵ واپـــــەرێشانن

***

## هەی دەربەدەر خۆم

هەی دەربەدەر خۆم، هەی دەربـەدەر خـۆم
ســـەرکز و مـــڵکز، هـەی دەربـەدەر خـۆم
«قەیس»ی سەرشێواو هەی خاکەسەر خـۆم
بـــەدبەخت و ڕۆژڕەش ژیـــانسەقەر خـۆم
بـێ بـەش لە دونـیای دیـن و دولبـەر خـۆم
ســـەر لەســەر ئـەژنۆ دەس لەکـەمەر خـۆم
هـاوڕێ و هـاودەمی سـەد جـانەوەر خـۆم
کـــاس و ســـەرشێواو زامـــی خەتەر خـــۆم

دیل و پێبەستی (ڕۆم) و (تەتەر) خۆم
باخەوانێکی باخی بێبەر خۆم
دوورکەوتوی وولات چاوبەگریان خۆم
بێبەشی کۆڕی خانەدانان خۆم
سەر تا پێ سوتاو دوورکەوتوی‌یار خۆم
دڵ بە ئازاری زامی‌نادیار خۆم
باڵا چەوتاوە زەرد و ڕیسوا خۆم
بێهۆش و کاس و شێت و شەیدا خۆم
جێی تیر و تانەی گشت ناکەسان خۆم
وێڵ و ئاوارەی کەژ و کێوان خۆم
گیری زەنجیر و پێبەستی «داو» خۆم
عەقڵ و هۆش و بیر تالانکراو خۆم
بێ‌کەس‌وکار و ڕیسوای زەمان خۆم
برسی و بەرەڵلا ڕووت و بێنان خۆم
گیرۆدەی فەرهەنگ یا بەند و دین خۆم
کەشتی‌شکاوی ناو دەریای «نیل» خۆم
ماڵ بە تالانچوو، مایە بەتاڵ خۆم
دڵڕەش وەک قەقنەس بە کۆی‌زوخال خۆم
ڕووزەردی دیوان دۆست و یاران خۆم
گیرۆدەی مەینەت وێڵی شاران خۆم

***

# ئەرێ تولْی نەی

ئـــەرێ تـــولْی نـــەی، ئـــەرێ تـــولْی نـــەی
ئــــــەرێ نـــــەونەمام بــــالْا تـــولْی نـــەی
ئـــەرێ دیـــدەمەست چـــاوپیالْەی پـڕمەی
سزای تـــۆ تـــاچەند ســـەبری مـــن تـــاکـــەی

***

ئـــەرێ ئـــەی شـــیرین بـــالْا زەڕ ســـتون
دارێـــژراوی حـــەق کـــارسازی بـــێ‌چون
من بووم بە «قـەیس»ی ئـاوارە و مـەفتون
ڕەنگ‌زەرد، پەرێشان زیاتر لە «مـەجنون»
چاو پڕ لە ئەسرین ڕەنگم زەرد وەک بەی
سزای تـــۆ تـــاچەند ســـەبری مـــن تـــاکـــەی

***

ئـــەرێ نـــەونەمام تـــازەو تـــەڕ و جـــوان
شـــۆخی چـــاوخومار فـــریشتەی ئـــاسمان
لە تـــــاوی بـــــالْات مـــــنی ســـــەرگەردان
تک‌تک خـــوێنی‌گەش ئـــەڕژێ لە چـــاوان
شەووڕۆژ ئـــەگـــریم ئـــە نـــالْێم وەک نـــەی
سزای تـــۆ تـــاچەند ســـەبری مـــن تـــاکـــەی

***

قــەسەم بــە تــاتای زۆڵـفی چـین‌چینت
بــە ووردەخــاڵ و عــەتری مـوشکینت
بــە گــۆنای ئــاڵ و شــوشەی جـەبینت
بـە شـەوق و جـوانـی شـێوەی شـیرینت
بــە وێــنەی «مـەجنون» بـیابان کـەم‌تەی
سزای تـۆ تـاچەند سـەبری مـن تـاکـەی

***

گەر باوەڕ ئەکـەی «زولـەیخا»ی سـانی...
بــــە ئــایەی قــورئان زاتــی ڕەبــانی
بــــەهەشتی ژیــــنم بــە تــۆوە، فــانی
لە داخــی بــاڵات حــۆری ڕیــزوانــی
تاکەی ناڵەی‌بێ دڵەکـەی مـن وەک نـەی
سزای تـۆ تـاچەند سـەبری مـن تـاکـەی

***

## ئەی دڵ بە «بەرد» بی

ئەی‌دڵ بە «بەرد» بی، ئەی‌دڵ بە «بەرد» بی
ئەی‌دیدە کوێـر بی ئەی دڵ بە «بـەرد» بـی
زوبــان تــۆ لاڵ‌بــی خــۆشی‌بەدەر بــی
ئەی لەش بەباربی ئەی ڕوخسار زەرد بی
ئــەی گــوێ نـەبیستی تـەواوی کـەڕ بـی
کپ و بــێ‌دەنگی بـاکـەی سـەڕسەڕ بـی

(طــالع) بـەکـامی مـن نـەبووی جـارێ
ئەی (طالع) و بـەخت بـەردتان لێبـاری
ئـەی فـریشتەی مـن پـێمبڵێ تـۆ کـوای؟
لەنـــاو فـــریشتان بــۆچی دەرکــرای؟
ئـەی ئــیقباڵی ڕەش سـەرنگون مـاوی
لە گــێژی ئــاوی «هــامون» خــنکاوی
خۆم بە خۆم ئـەڵێم بـەکـۆی زوخـاڵ بـم
فـــەنا و ســەرگەردان مــایە بــەتاڵ بــم
چــەنسال تـەوەللا لە شـادی و خـۆشی
خـــوێن و زوخـــاو و ئــازارم نـۆشی
شـەووڕۆژ بــێخەو گــەرمبــوو شــینم
تـــا بــــەژن و بـــاڵای لەیـلم بـبینم
خـەوی مـەرگم بــێ، خــەوم کــردبوو
چـاو لە خــەوابــوو «شـەم» ڕابـوردبوو

***

## بایەقوش ناڵان

بــــایەقوش نــاڵان، بــایەقوش نــاڵان
تــۆ ئــەکـێشی هـۆ، مـن تـا ڕۆژنـاڵان
مـــن خــێڵی شــادیم کــراوە تــاڵان
تــۆ دەردت چــیە هــاودەردی ســاڵان

من «پەروانە»ی شەوق «شەم» جەماڵێکم
کوشتەی نیگای ناز سۆسەنخاڵێکم
ناڵەناڵی من لە سەودای یارە
دڵم لە دووری ئەو بێ قەرارە
تۆ شەو هەتا ڕۆژ سەرووەتت نیە
دەردەداری کێی ئازارت چیە
من سووتاوی گڕ بڵێسەی نوورم
بەڕۆژ ئەسوتێم بەشەو «دەیجور»م
تۆ داخ و دەردی کێت لە دەروونە؟
وەک من سەرگەردان جەستەت زەبوونە
من موبتەلای دەرد مەست و مەفتونم
جێگە نشینی «قەیس»ی مەجنونم
تۆ لە عەشقی کێ وێڵ و دێوانەی؟
شەوان بێ خەوی لە جێی وێرانەی
سەد خۆزگەم بەتۆ نیتە داخ و ئێش
قەت بەمن نەبێ جەور و جەفا کێش
تۆ هەر عاشقی جێگەی وێرانەی
بێباک لە لۆمە و تەشەر و تانەی
منیش فەوتاوم بەم گشت داخەوە
لە دووری «شەم»ی شەوچراغەوە

بـــەڕۆژ خـــەریکی گـــەنجی مـــاتەمم
بـــەشەو لە یـــادی ســـەرگۆنای «شـــەم»م

***

## بێزاری هۆزان

بـــێزاری هـــۆزان، بـــێزاری هـــۆزان
«قـــەیس»ی ســـەرشێواو بـــێزاری هـــۆزان
ویســـتتان بـــمبینن دڵســـۆزەکـــانم
هـــەردەکـــەی (نـــەجد)ە شـــوێنی ژیـــانم
گـــەر یـــادتان کـــردم دۆســـتان و یـــاران
یـــا وێـــڵی هـــەردم، یـــا لە کـــۆساران
هەرشوێنێ کە زوو جێگەی «مەجنون» بوو...
پەستراوی ژێری «قەیس»ی مەحزون بـوو...
ئـــەوشوێنە جـــێگای هـــەڵس و کـــەوتمە
جـــێ‌ی ڕازی دڵـــەی قـــەت نـــەسرەوتمە
هەرجێ‌یەک خاک و خۆڵی بـە قـوڕ بـوو...
جـــانەوەری زۆر لەوشـــوێنە پـــڕ بـــوو...
ئـــەو قـــوڕە قـــوڕی گـــریانی مـــنە
جـــانەوەر پـــاکی مـــیوانـــی مـــنە
لەســـەر هـــەر بـــەردێ شـــانم دا دابـــێ...
بـــێ تـــۆ لەو بـــەردە زوبـــان پـــەیدا بـــێ

پــرسیاڕ لە بــەرد کــەن ئــەزانــێ حــاڵم
لە قـــــرچـــــەی دەروون لە ژیــانی تــاڵم
ئـــەگــەر لەو جــێیە نــیشانم نــەبوو...
ئــــاساریٚ لە جــێی وێــرانــم نــەبوو...
ئـــەوسا بـــزانـــن مـــەحاڵە بــوونم
لە هـــەردانکــەوتو وێــنەی «مــەجنون»م

***

## بارەکەڵلا «شەم»

(بارک اللّه) «شەم»، (بارک اللّه) «شەم»
خالق چـۆن «شـەم»ت هـێنایە بـەرهەم؟
نــەقاشی قــودرەت ڕای‌کــێشا قـەڵەم
لەم سەرزەمینە (لا) وێنەی «شەم» کەم!!!
تۆ تیشکـی نووری هەڵدێی سوبح‌دەم
ئاسمان چەماوە لەجـوانـیت بـوو خـەم
ئەبرۆت وەک کەوان خـالقی (ئـەعزەم)
خــەدەنگ ئـەهاوێ بـۆ دڵـەی پـڕ خـەم
سـرکـی بـەوێنەی ئـاسکـی خـۆش‌ڕەم
گــیانبەخشی بـێ‌گـیان پـێکەنینی دەم
تیری برژانگت تـیپ‌تیپ کـردون جـەم
بێ باک ئـەی‌هاوی بـۆ گـیانی خـەستەم

زوڵفت دا پۆشی مانگی ڕووت وەک تەم
جوانیت بە وێنەی «مەسیحا»ی «مەریە»م
ڕۆخساری گەشت مانگی چـواردەهـەم
دەمت شەکـراوی سـەرچـاوەی زەمزەم
ســیودوو ددانت مـرواری سـەر جـەم
لێــوت وەک لێـوی پـیاڵەی عــەجەم
خـــاڵت سـلێمان کـردی بــە خــاتم
دو دانــە گــەوهەر پـێیان ئـەڵێن چـەم
سێوی سەر سینەت تـازەو گـوڵ بـە دەم
بــە خــوا وێـــنەیان لە بــەهەشتا کـــەم
یــەزدان بــەم جــۆرە هــێنایەبەر هـەم
بــۆیە بــەم چــەشنە نــاوینرا شــەم
دەنگی زولاڵت بۆ زامان مەرهەم

***

## باڵندەی تیژباڵ

بــاڵندەی تــیژباڵ، بــاڵندەی تـیژباڵ...
قــازان قــوڵەنگان، مــەلانی تــیژباڵ...
بــۆم بکــەونە ڕێ سـا بـەهەر ئـەحواڵ
بــچن بــۆ ئــێلاخ شــوێنی دیـدەکـاڵ
بگــەڕێن لوتکــەی چــیای لەیــلاخان
هــەوارگــەی خـۆشی بـوڵەند دەمـاخان

ئــەبینن ڕەشمــاڵ چــەند هــەڵدراوە
جــــوانــــان لەنــاویا شــانیان داداوە
پۆل‌پۆل وەک پەری نازدارانی جـاف...
جوان و نازەنین گەردن شوشەی ساف...
هەموو خــان و مــان کـۆڵوانـە لە کـۆڵ...
ئاڵاو واڵاپۆش جوان و گـورج و گـۆڵ...
یــەک‌یـەک شـۆخانی ئـێڵی مـورادی...
لە کـــوێستان لەگـەڵ قـیبلەم بـە شـادی
بگــەڕێن بــەسەر گشت ڕەشمــاڵاندا
ســـووڕ بـخۆن بـەلای سـۆسەنخاڵاندا
خــەبەر کــەنەوە، خــەوتوون لە خــەو
بــا ئــاگــادار بـن، ڕۆیـی تـاری شـەو
جوانان لەگەڵ «شەم» ڕومەت وەک هەتاو
لەوێ هــــەمویان ئــــەبینن بــــەچاو
خۆزگە وەک ئـێوە مـنیش مـەل ئـەبووم
بــە بــاڵ ئـەفڕیم، بـۆ جـێیە ئـەچووم
بــــەهێزی بــاڵم ئــەچوم بــۆ جـــێیە
ئــەوشوێنە ئـێستا وونبــوومی لێـەا!
تــا «شـــەم»م لەگــەڵ پــۆلی جـوانـان
تــێر بـەچاو ئـەدی کـە دێ بـۆ نـاوڕان

***

# ئەی چرای ڕووناک

ئەی چرای ڕووناک، ئەی چرای ڕووناک
فـــەلەک بـــێمەیلە بـاوانت بـێباک
تۆ «لەیل»ی دێرین من «قەیس»ی خەمناک
چۆن بگـەینە یـەک خـوای تـەنیا و تـاک
گەر بـەسەر ڕازیـن پـێش‌کەشتان‌بێ سـەر
گـەر گـیانتان ئـەوێ گـیانم بـێتە دەر
گـەر مـاڵتان ئـەوێ بـێماڵ و حـاڵم
شـێت و سـەوداسـەر وێـڵ و عـەوداڵـم
هـەموو هـەوڵێکم گـەیشتن بـە تـۆیە
بـەتەمای هـیچ‌نیم لەم کـرد و کـۆیە
گـەر بـۆ دادگـا بـەرم مـن هـاوار
دیـارە بـاوکتە زاڵـم و تـاوانـبار
ئـاخ بـۆ «نـۆفڵ»ێ کـارم مـەیسەرکا
مـن بـەتۆ شـادکا نـاحەز بێ سـەرکا
ئـەمجا بگـەڕێن لە کـوچە و خـێڵ‌دا
بـەشوێن «پـەروانـە»ی ئـاوارە و وێـڵ‌دا
مـنیش ڕووبـەڕووت بـە دڵ و بـە گـیان
کـەژاوەت بگـرم بـتهێنمە دیـوان
هـەرگیز مـەترسە کـە نـاوت نـەنگ بێ
بـاوکت لەم‌کـاتە زوبـانی لەنگ بێ

قــەوم و خــوێشانت پـاکـی بـەدناو بـێ
ئـــەمکارە بـــۆ مـــن کـــارێ تـــەواو بـــێ
مـــن بـــێسامانم بـــێپارە و بـــێ پـــووڵ
کـــرداری ئـــاواقـــەد نـــاکـــەم قـــەبووڵ
هـــەتا زیـــندوبم لەســـەر ڕووی زەمـــین
مـــن بـــە مـــەیلی تـــۆ ڕائـــەبورم ژیـــن
خـــۆ ئـــەگـــەر ڕۆژێ دونـــیات بـــەکـام بـێ
هـــاودەمی شـــەوت (ابـــنسلام) بـــێ
ئـەوسا ئـەو دەردەش بـا لەبـان دەرد بـێ
تۆ خۆشبی بامن هەر جـێگەم هـەرد بـێ

***

## نامە

نامەی مەلا «عومەری ڕەنجوری» بۆ «وەلی دێوانە»

زانای خـۆشخەیاڵ، زانـای خـۆشخەیاڵ
زانـــای هـونەرمەند تـوانـای خـۆشخەیاڵ
دانـــای دوڕشـــناس، کـــانگەی پـــڕکەماڵ
نـــاسکبینی ڕاست، ئـــاگـــاداری حـــاڵ
هـــونەری خـــۆشگۆ گـــەنجینەی زەمـــان
بـــەیتت پـــڕمانا، «ســـەعدی» خـــۆشزمان
جـێنشینی جـێی «حـاجی» جـەوهەردار
جـــەواهـێر فـرۆش، سـەرچـاوەی ئـەشعار

«پەروانە»ی دەوری «شەم»ی ڕوومەت گوڵ

شـەیدایـی شـێوەی شـیرین لەنـاو دڵ

لەسـەر زەمـین پـاک دڵ وەک ئـاوێنە

«قـەیس»ی قـەدیمساڵ «تـاکـە»ی بـێوێنە

زامـاری جـیایی دڵ کـورەی ئـاگـر

ئـەوەی مـن ئـەڵێم لەلاتـە زاهـێر

زیـاتر لە زومـڕەی خـاوەنکەماڵان

زەوقـی دیـدەنمە شـاهی عـەوداڵان

مـەیلم لە خـۆشی گـفت و گـۆی تـۆیە

وتـەت شـادبەخشی دڵـەی تـوێتوێیە

خـواوەنـدی پـاک ئـاگـای لە حـاڵە

تـاسەی دووری تـۆم هـەر لە خـەیاڵە

هـەرکەسێ کـە دێ لەو شـوێن و جـێیە

لەو بـیابانەی یـانەی تـۆی لێیـە

بـەکـوڵ ئـەپرسم حـاڵ و ئـەحواڵت

وەرئـەگـرم، چـۆنە ژیـانی تـاڵت

بـڵێ زانـای بـاش دۆسـتەکـەی گـیانی

تـۆ لە بـارەی مـن شـتێ نـازانـی؟

تـۆ هـیچ نـاپرسیت لە ئـێشی گـیانم؟

لە پـەشێو حـاڵی و دڵـی پـڕژانـم؟

هـــــیوام ئـــــەوەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان
لە تـــۆوە بـــۆم‌بێ نـــامەیەکـــی جـــوان

خـــۆزگە بـــۆم‌ئەهات نـــامەی پـــیرۆزت
سکـــــــالا و دەردی دڵـــی ئـــالۆزت

بـــۆچی بـــە نـــامەت تـــۆ نـــامکەی دڵشـاد؟
یـــادت بـــەرێکە بـــا نـــەچی لەیـــاد

مـــن بـــۆ یـــادگار نـــامەم بـــۆ نـــاردی
تـــا تـــۆیش یـــادمکەی بـــەخوام سپاردی

کـــاتێ یـــادی‌تۆم هـــێنایە بـــەرهەم
تـەمەن گـەیی‌بوە: «پـەنجا»، «پـێنج»ی کـەم

ســـاڵی هـــەزار و دوســـەد و نـــۆ بـــوو
نـــامەی نـــوسراوم بـــەرەولای تـــۆ بـــوو

«ڕەنـــجوری» ڕەنـــجۆر پـر ئـێشی دونـیام
بـــۆ جـــوابـــی نـــامەت چـاوەڕێی ڕێگـام



## وەلام

### وەڵامی نامەکەی «ڕەنجوری»
### لەلایەن «وەلی دێوانە»وە[1]

---

١. کاتێ ئەم هۆنراوەیەت خوێندەوە، ئەتوانی بڵێی کە «وەلی» خوێندەوار نیە!!!؟ یانێ «وەلی» شوان بووە لەبەر مێگەل؟. جا تکایە بەووردی سەرنج بدە و خۆت وەلامی خۆت بدەرەوە. ڕازی

زانـــــای دوڕشـــناس، زانـــای دوڕشـــناس
مــەولای «ڕەنــجوری» دانــای دوڕشـناس
هــەیاسی زانـــا ئــەسڵ و نــەسەب خــاس
نـــــەتەوەی خــــاسان (نــظامی) قــیاس!!!
(فــیردۆسی تــوسی) (جــامی) مــەلەک‌جــام
(خـــــاقانی) خـــەیاڵ، (ئــەنوەری) ئــەیام
(ســـــەعدی) قســـەزان دەریـــای مـــەعانی
(حـــافظ)ی «شـــیراز»، (صـــائب)ی ســانی
بـــە تـــاکـــی خـــوای گـــەورە و بـــێ‌هاوتا
هـــاوتای تــۆ نـــاکـــەن لەســـەر ڕووی دونـیا
(شـــــەوکەت) نـــوقمی دەریـــای مـــەعناتە
(عـــیسمەت) لە وەســـفی ســـیفاتت مـــاتە
مـــــەولانا (ظــــــهیر) (فـــارابـــی) دەوران
(فیض‌اللّە)ی (فاضل) (نادری) خۆش‌خوان
چـــــەند شـــاعیر هـــەبێ بـــەو نـــاونیشانە
عـــــــیلمت ئـــــەخوێنن لە قـــــوتابخانە
(غـــــواص)ی قـــوڵی‌ی دەریـــای عـــلومی
شیعرت (مـەسنەوی) یـا مـەلای (ڕومـی)[1]
تـــۆ شـــوکر کـــەهەیت ســـایەت بـــێ زیـــاد
مــــن چـــیم بـــەم‌جۆرە مـــنت هـــاتەیاد

١. مەبەست: مەولانای ڕومی‌یە، خاوەنی کتێبی (مثنوی).

بـــێ لە پــــیاو تـــی و گـــەورەیی کـــردن
چــــیە هـــەژاری وەکـمـــن یـــادکردن
هــــەڵبەت زانــــیوتە هــــەناسە ســـاردم
لەڕوی بـــەزەیی نـــامەت بـــۆ نـــاردم
ئـــەوابــۆمدەرکەوت زانــای دەرونکــەیل
تــۆ خـــاوەن لوتــفی یــانێ مـن بـێ مـەیل
مـــن ســـوێندم بـــە زات پــاکـــی یــەزدانــە
هــــەمووکات نـــاوت ویـــردی زوبـــانە
هــەرچــەند بــە خــزمەت تــۆ ئاشنا نیم
بــــەڵام لە یـــادت ســـاتێ جــیا نـیم
شــــەوورۆژ دڵــــی گـــەرمی «پــەروانــە»
ئـــارەزوی جـــارێ دیـــدەنتە گـــیانە
قـــەت وا تـــێنەگـەی گـیانی شـیرینم،
نـــــیشانەی مـــەردی لەتـــۆ ئـــەبینم
چـــیت لەنـــاودڵە هـــەر لە نـــەدیدە
قـــەد لەیـــاد نـــاچی ڕونـاکـی دیــدە
ووتـــەت پـــێشڕەوی نـــوسراوی مــنە
نـــامەت ڕونـــاکــــی دووچـــاوی مـــنە
(وەیس) چەند پێیخۆشبوو (نەبی) ببینێ
مـــن زیـاتر هـەستم بـۆلای تـۆ دێـنێ

قــەت خــەیاڵ نــەکــەی کــە لەتــۆ دوورم
«دێــوانــە»م بــەندەی مــەلای »ڕەنــجور»م

***

## شیوەنی «ڕەنجوری» بۆمەرگی «وەلی دێوانە»

یــــاران بـــێهەستم، یــــاران بــێهەستم
یــــــاران لە داخـــــی دڵــــم بـــێهەستم
حـــــاڵ پـــــەرێشان و دڵ مـــارانگــەستم
ژیـــــان و شـــادی دەرچـــوو لە دەســـتم
پــــەنگی خـــواردەوە هـــۆنراوەی جـــوانــم
خـــــەفەت وەک و کــــێو بـــارە لە شـــانم
بــــە لێــڵی ئــەسرین لە چــاو دێــتەخوار
دیـدەی بـینینم تـاریک بـوو یـەکجار
ئـــــــاگــــــر لە دڵ و دەروون بــــەربووە
دوکـــــەڵی «ئـــاه»م چـــیای گـــــرتووە
بـــۆ کـــۆچی دواکـــۆچ!، «وەلی دێــوانــە»
نـــــاوداری عــــەشق «مـــیرزا»ی زەمــانە
خـــــاوەنی شـــــیعری ئـــــاودار و بـــەتام
«مـــــیرزا وەلی» بـــوو «دێــوانــە»ی پــڕفام
خـاوەن بـەیت و فـەرد کـانگای کـەماڵ بـوو
بـــەزم و نـــەزم تــەڕ، خـــاوەن خـەیاڵ بـوو

دانـــا و زانـــا، ســـاحێب ئـاسار بــوو
لە هـەڵبەستی جـوان پـێشکەوتوو دیـار بـوو
ویــردی ســەرلێوی خــاوەن وەزیــر بــوو
بــــەیتی پــــڕمانا زۆر ڕۆشــــنبیر بــــوو
چــــرای ڕوونــاکــی ئــێڵی جــافان بــوو
شـــانەی لەتلەتی پــــرچ کــڵافان بـــوو
دەنگــــــــی دابــــوەوە لە هــــەمووشاران
بــــەرزی کــــردبوەوە نــــاوی نــاوداران
هەرچەند کەم دو بـوو شـیعری خـۆشتەرزە
لە ســـایەی شـیعری تـیرەی سـەربەرزە
(زەنـد) و (زەنگـەنە) (جـاف) و (پـاڵانی)
هــەموو ســەربەرزن بــە «قـەیس»ی سـانی
لە شــیعری شـیرین تـەواو مـەشهور بـوو
لە هەڵبەستی جوان (سەعدی) دەستور بـوو
نــازدار و جـوانـی (بـن کـوڕە) و (زەهـاو)
خــــانەدانــــانی ئــــێرە و ئــــەوبەر ئــاو
هــــەمیشە دڵشـــاد بــە شـیعری خـۆشی
عــەشقیان گــەرمکــا عــەشقی لە جـۆشی
ســــینگی ســەدەفی گــەنجینەی دوڕ بــوو
دڵ و دەروونـــــی لە زانـــــین پــــڕ بــــوو

زوبـــانی ڕەوان (زەنگـــەنە) و (زەنـــد)
بـــۆی بـــەجێ هـێشتین ئـامۆژگاری و پـەند
حەیفە حەیف چەرخی چەواشەی چەپگەرد
«میرزا»ی هەڵکەوتووی ئەمڕۆی ئێمەی بـرد
بـــادەی مـــــردنت بـــەزۆر پـــێنۆشکرد
ڕوی لە جـــــیهانی کپ و خـــــامۆشکرد
کـــــێبێ لەدوای ئـــــەو ئـــــاوابـتوانـــێ؟
کـــێ ڕەســـم و قـــانون «مـەجنون» بـزانـێ؟
کـــێ مـەدح و سـەنای بـاڵای جـوانـان کـا؟
کـێ نـووری چـاوی پـێشکەش چـاوان کـا؟
کـــێ «پـــەروانـــە»بـــێ بـۆ «شـەم»جـەبینان؟
کـــێبێ ســـەناخوان پـــەرچـەم مـوشکینان؟
کـــــێ لە بــــای شــــەماڵ بــــپاڕێتەوە؟
کـــــێ بـــــەرد بـــــە «ئــاە»ی بـــتاوێتەوە؟
دوای مـــــەرگی بـــەڕێز «مـــیرزا»ی پـــڕمایە
خــــۆزگە ئـــەم چـــەرخـــە هـــەڵبگیرایـــە
خـــــوایـــــە ڕوی ڕەحــــمی لێ بـــدەرەوە
لە بــــــەهەشتی خـــۆت جـــێی بکـــەرەوە
«ڕەنـــجوری» بـۆ مـەرگ «مـیرزای دێـوانـە»
ئــــــاخ و داخیـــــــە لەدەس زەمـــــانە

***

## لە ڕێگەوبانا[١]

لە ڕێگـــــــەوبانا، لە ڕێگـــــەوبانا
ڕۆژێک لە ئـــــێلاخ لە ڕێگـــــەوبانا
دیــم «شـــەم» خـەوتبو لە دەمبـەیانا
ئـەگـریجە و پـەرچـەم تـاتا لە شـانا
وەک پەڕی «تاووس» تاتا لەسەرخاڵ
بـــڵاون لەســـەر گـۆنای گـوڵی ئـاڵ

***

## هاوار لە بەختم

هــاوار لە بـــەختم، هــاوار لە بـەختم
هـــاوار لە ڕەشـی و نـاپوختی بـەختم
هــاوار لە ئـــێشی زامـــانی ســـەختم
هـــاوار، دڵســـۆزێ بـێتە سـەروەختم
هــاوار کـــۆستکەوتوی زەمـانە مـنم
هـــاوار بـــێ کـــەس و «دێـوانـە» مـنم
هـــــاوار نـــوقمی گـــێژی دەرد مـــنم
هـــــاوار ئـــاوارەی کـــێووهەرد مـــنم
چـــاو بـــە فـــرمێسک و بـــەئازار مـنم
بـــێیار و بـــێدڵ بـــێخەمخوار مـنم

١. ئەم هۆنراوەیە ناتەواو دەستکەوتووە.

ڕۆژ بـــێمودارا شـــەو بـــێخەو مـــنم
فـــریشتەگـــیراو بـــەخت شـــەو مـــنم
ئـــاوارە و وێـــڵی نـــاو شـــاران مـــنم
غـــوولی بـــەرەڵّلای کـــۆساران مـــنم
دەرون هـــەڵقرچـــاو ڕەفـــێقکەم مـنم
«پەروانە»ی دەوری گۆنای «شەم» مـنم
یـــاران تـــەگبیرێ، چـارەیەک کـارێ
دەرمـــانی دەردم وا لە کـــام شـــارێ؟
بـــۆکـــەسێ نـــییە بـــێتە هـانای مـن
دەرمـــــانکا دڵـــی نـــاتەوانـــای مـــن
مـــەگـەر هـەر یـەزدان فـریام بکـەوێ
ئـــەینا هـــەناسەم ئـــەگـــیرێ شـەوێ
تەواو



سۆز و ئەوینی هۆنەرێکی وەک و «وەلی» بەتایبەتی کە ئەم کارەساتە گرنگەی بەسەراهات ئەوەئەگەیێنێ کە هۆنراوەی یەکجار زۆربێ، بەلاّم کەمتەرخەمی و کەمی خوێندەوار لەو چەرخەدا بووە بەهۆی لەناوچوونی گەلێک لەو هۆنراوانە، تاکەتاکەیەکی نەبێ کە دەماودەم وەرگیرابێ، یان لە پشت کتێبی فەقێ و مامۆستاکانی ئەوسەردەمە نوسرابێ و لە لایەنی ئەدەب دۆست و هۆگرانی هونەر و ئەوانەی کە بەدوای کەلەپوری نەتەوەیی دا ئەگەڕێن، کۆکرابێتەوە، وە ئەم چەن لاپەڕەیەی لێ کۆبوەتەوە.

ئینجا بۆ ئەوەی ئەم کەلە پورە نایابە نەچێتە پەردەی نەبوون، زۆر بەتاسەوە تکا لە هەموو ئەدەبدۆست و ڕۆشنبیرێک ئەکەین کە ئەگەر هەرکام لەوان هۆنراوەکانی «وەلی» نەمری، لایە بێجگە لەمانەی کە بە چاپ گەیشتوون بۆمانی بنێرێ تالە هەل و فرسەت و دەرفەتی خۆیدا چاپی بکەین و بڵاوی بکەینەوە. بۆ ئەم مەبەستە بە چوار چاو چاوەڕوانین. ئیتر هەموان بە خوای گەورە ئەسپێرین.

ڕازی

# دیوانی وەلی دیوانە

## بەشی هەورامی

سدیق سەفیزادە هێناویەتە سەر ڕێنووسی نوێ

بسم الله الرحمن الرحيم

(١)

# ئەریٚ هەی تولٚی نەی

ئەریٚ هەی توولٚ نەی، ئەریٚ هەی توولٚ نەی
ئەریٚ هەی نەونەمام قامەت توولٚ نەی
ئەر هەی دیدەمەست چەمپیاڵەی مەی
سزای تۆ تا چەند سەبر من تا کەی

***

ئەریٚ هەی شیرین قامەت ئەر ستوون
رەژیدەی قودرەت کارساز بیٚچوون
منت کردووە «قەیس» سەرگەشتەی مەفتوون
ڕەنگ زەرد و زایف بەتەر جە «مەجنون»
مەگیٚلٚوون هەردان وە جەستەی پڕ وەی
سزای تۆ تا چەند سەبر من تا کەی

***

ئەر هەی نەونەمام تازە ڕەسیدە
سەرووناز سونع «سانع» کەشیدە

جـــە دووری بــاڵات ئــەی بــەرگوزیدە
هـــەر دەم مــەوارۆ هــووناو جــە دیــدە
شــەوان تــا وەرۆ مــەناڵوون چــون نــەی
ســزای تــۆ تـا چـەند سـەبر مـن تـا کـەی

***

قــەسەم بــە تــوغرای زوڵفی چـین‌چینت
بـــەو وردە خــاڵان ســیای مــوشکینت
ئـــەر بـــاوڕ داری «زلـــێخا»ی شــانی
بـــە ئـــایەی کـــەلام حــەق ڕەبــبانی
بـــەهەشت ڕۆحـــم بـــی وە تــۆفانی
جـــە داخ بـــاڵات حـــوور رزوانـــی
بە وێـنەی مـەجنوون هـەردان کـەردم تـەی
ســزای تــۆ تـا چـەند سـەبر مـن تـا کـەی

***

(٢)

## ئەی دڵ وە سەنگ بای

ئەی دڵ وە سەنگ بای، ئەی دڵ وە سەنگ بای
ئەی دیدە کۆر بـای، ئـەی دڵ وە سـەنگ بـای
ئەی «زووان» لاڵ بای ئـەی خـاتر تـەنگ بـای
ئـــەی «تــەن» تــاویای ژار فــەرەنگ بــای

ئەی «گۆش» نەژنەوا هەر یەکجار کەڕ بای
ئەی کەڕ وە غەزەب باد سەرسەڕ بای
ئەرێ تاڵەی من غەزەب وارۆ لێت
ئەرێ بەخت من تەوەن وارۆ پێت
ئەی فریشتەی من وە فەرمان حەق
فریشتان عەرش شەقت کەران شەق
ئەی ئیقباڵ من هەر سەرنگوون بای
سەرنگوون نە قەعر ئاب «هاموون» بای
وێم بە وێم واچوون بە کۆی زوخاڵ بای
تەن نە غەرق بەرق فەنا پاماڵ بای
چەند ساڵەن کە ڕەنج ڕیازەت بەردم
هوون زووخ زام ڕیشەی دڵ وەردم
ئاخ و داخم بێ شەوان تا وەڕۆ
بوینۆ باڵای لەیل عەنبەر بۆ
خاو مەرگم بی، خاوم کەردە بێ
دیدەم نە خاو بێ «شەم» ویەردە بێ

***

(۳)
## بایەقوش ناڵان

بایەقوش ناڵان، بایەقوش ناڵان
تۆ هۆ کێشەنی من هەر شەو ناڵان

من خێڵ شادیم شەخسێ کەرد تاڵان
تۆ چێش پێت ئامان هامدەرد ساڵان
ناڵەی من جە سۆک سەودای ئەو یارەن
دڵم جە دوری ئەو بێ قەرارەن
من «پەروانە»ی شەوق «شەم» جەماڵێکم
کوشتەی نیگای ناز سۆسەن خاڵێکم
تۆ شەوان تا ڕۆ بانگ هۆهۆتەن
دەردەکەی دووری زامەت جە کۆتەن
من سفتەی سۆزان شۆڵەی ئەو نوورم
بە ڕۆ هەراسان بە شەو «دەیجوور»م
تۆ داخ هجران کێت نە دەروونەن
چون من سەرگەردان جەستەت زەبوونەن
من موبتەلای دەرد مەست مەفتوونم
جانشین جای «قەیس» مەجنوونم
تۆ جە عەشقی کێ وێڵی و دێوانە؟
شەوان بێداری نە جای وێرانە
خۆزگە پێت سەد جار دەردین دڵڕێش
وە جەستەی من نیت جەور و جەفا کێش
تۆ هەر نە خەیاڵ جای وێرانانی
بێباک و لاقەید تیر و تانانی

دریـــغا مـــنیش وەی‌گشت داخـــەوە
وە داخ ئـــەو شـــەم شـــەو چـــراخـــەوە
شـــەو خـــەریک کـونج جـای مـاتەم بـیا
شـــەوانـــیچ نـــە بـــەزم شـادی شـەم بـیا

***

(٤)

# بێزیای هۆزان

بـــێزیای هـــۆزان، بـــێزیای هـــۆزان
هـا بـیم وە مـەجنوون بـێزیای هـۆزان
ئـــەگـــەر وە ئـــەو زام بـیان دڵـســوزان
مەگەر نە هـەردەی (نـەجد)م بـدۆزان
ئـــەر یـــاران یـەکـێ ئـەو یـادم ئـاران
یا هەم جـە هـەردان یـا جـە کـۆساران
هەر جاێی مەقام ماوای مـەجنوون بـۆ
مەنزڵگەی مەجنوون مات مەحزوون بۆ
ئەو مەنزڵ مەقام ئەو مەسکەن جـامەن
ئەو ماوا و مـەکـان یـوورت مـاوامـەن
جە هەر جاێـی خاک زەمین پڕ نەم بـۆ
جە هەر کۆ کۆمەی وەحشیان جەم بـۆ
ئـەو جـا جـای سـەیلان گـریان مـنەن
ئـــەو کـــۆمە کـــۆمەی دیـــوان مـــنەن

هەر سەنگێ جێگەو دەس یارم بۆ
یاران هەر کەس یار غەمگوسارم بۆ
ئامانت هەواڵ من بپەرسان جێش
مەر ئەو بواچۆ حاڵ وێڵیم پێش
ئەر بەی نشانان نشانم نەبۆ
ئاقاری جە یوورت وێرانم نەبۆ
تاقی بزانان بێشەرت و شوونم
بێسەودا جە فکر سەودای مەجنوونم

***

(٥)

## جەو راگوزەردا

جەو ڕاگوزەردا، جەو ڕاگوزەردا
یەک ڕۆ جە «لێلاخ» جە وڕاگوزەردا
دیم «شەم» خەفتە بێ جە سوب سەحەردا
ئەگریجە و زوڵفان پەخش بی وە بەردا
ئەگریجە و زوڵفان بووک تاووس باڵ
پەخش بی نە دەور گۆنای گوڵ میساڵ
منیش پەی ئیحسان ئەوسا جەو دەمدا
ئەگریجە و زوڵفش شانام وە هەمدا
ئاوەردم پەی وێم وە دەوان دەو
زانام سوودش هەن پەی بێ خاوی خەو

فدای نەسیم بام عەطر شەم پێش بێ
ئەمشەو زامانم یەک یەک سارێژ بێ
نەسیم ناوەردای دەوا پەی دەردم
بێ شەک جە دوری ئەو من مەمەردم

***

(٦)

## جەی شۆڵەی «شەم»ە

جەی شۆڵەی «شەم»ە، جەی شۆڵەی «شەم»ە
ئەی بارەکەڵڵا جەی شۆڵەی «شەم»ە
جەی نوور مونیر چەرخ چوارەمە
جەی شەوق جەماڵ مای دوو هەفتەمە
جەی تاق میحراب ئەبرۆ کەمانە
جەی مەودای موژگان مەست قەترانە
جەی سیم «ئەنف» ئەلف نگارە
جەی گۆنای گوڵبێز گوڵ و گوڵزارە
جەی زوڵف کەمەند دڵان پێ گیرە
جەی حەڵقەی تەناف گێسوو و زەنجیرە
جەی لەعل لەبان پڕ جە گەوهەرە
جە ڕاز ڕازان ڕێزەی شەکەرە
جەی چای زەنەخدان شێوە شیرینە
جەی «زنج» زیبای تۆپ زێڕینە

جــەی مــینای بــلوور مــەملوو جــە بــادە
جــەی ســاقی گــەردەن ســوراحــی ســادە
جــەی نــیمنیگای نــاز ئــەو نــازفرۆشە
جــــەی گــــۆشواران ئــاوێزای گــۆشە
جــەی جــفت قــەندیل چــەمان جــە نــوورە
جــــەی ســــەدر ســینەی ســفید بــلوورە
جــەی سـام سـەنگین ئـی سـام سـەنگینە
جــەی «ســاعد» ســیم پــەنجە ڕەنگــینە
جـــــەی ڕام خـــاو ڕەفت غـــەزاڵـــە
جەی «کەتف» و «کەمەر» ئـاهووی بـەرماڵە
جــەی «چــەم» غــەزەب شــیرین نگــارە
جــەی «نــاف» مشکــین ئــاهوو تــەتارە
ڕوو تەرح تەسویر سەنعان کـەرد جـە دیـن
وەڵــڵا مــەر شــێوەی گــوڵئەندام چــین
چــەن ئــەییام ســەردار سـەوڵان تـەڕ بـۆ
ئــەسپەردەی ئــیمام زامــن خــەبەر بــۆ

***

(٧)

## چراغم ئاوان

چــــراغــم ئــاوان، چــراغــم ئــاوان
ســەرزەمین وە زەوق دیــن تــۆ ئـاوان

باڵات سەنگەرچەی نەوتووڵ ساوان
ساوای گوڵستان (جنّةالمأویٰ)ان
گێسووت بەڕەزای پەخش پای کاوان
زوڵفت ئەگریجەی باڵ «بەط» ئاوان
یا چون چنووران نە سەر کڵاوان
چابوکی وازان نە دەور چاوان
دیدەت چون دیدەی ئاهووی بەر تاوان
گونات گوڵغونچە جە نۆ شکاوان
لیمۆت گوڵ وەدەم هێمای نەیاوان
نمناکەن وە عەتر شەوبوێ شەتاوان
خاڵ نوختە سۆسەن پای خورەتاوان
من جەو خاڵە دەرد مەجنوون پێم یاوان
نەمام نەوخێز نازدار باوان
تۆنی شای سۆسەن نە سەر سەراوان
هیچ کەس نزاکەت نازت نەتاوان
هەر یەک من نەبۆ شای چەم سیاوان
من وێڵم پەی تۆ سوب تا خورئاوان
کاوان، کڵاوان، گشت وە من ئاوان
جەوساوە وە نێش نیگای تۆ کاوان
شەوان حەرامەن جە دیدەم خاوان

شـــەو تـا ڕۆ چـەنی بـەخت وێـم داوان
جام هـانە سـەر فـەرق قـوللەی کـڵاوان
فدای دیـدەت بـام شـای چـەم سـیاوان
ڕەحمێ کەر وەحاڵ بـەندەی بـێ تـاوان

***

(٨)

## چراغم بیڕام

چـــراغـــم بـــیڕام، چـــراغـم بـیڕام
فـــەڵەک بـــێمەیلەن، بـــاوانت بـیڕام
تۆ «لەیل» قـەدیم مـن «قـەیس» ئـەییام
چون مـەبۆ حـاسڵ عـومرم وا بـە کـام
ئـەر وە سـەر رازیـن سـەر نـە پـاشانم
گیان وە سـەر تـوفەیل خـاک ڕاشـانم
ئـەر مـاڵ مـەسۆزان مـن بـێ مـاڵەنان
مـــەجنوون مـوفلس خـەم خـەیاڵەنان
غەیر جەسەودای عەشق دین تۆ دیدەم
ڕابەر نـیم وە هـیچ ئـەی بـەرگوزیدەم
ئـەر وەلای حـاکـم داد وێـم بـەروون
داد و بێداد جە دەست باوانت کەروون
تەرسوون حەکایەت «نەوفەل» بدۆ سەر
تۆ شـاد وە بـاوان مـن هـەر دەربـەدەر

ئـــەرنا گـــارۆیی نـــە کـــۆچ خـــێڵدا
وێـڵبای وە مـاوای مـەجنوون وێـڵدا
هۆرداروووت بە ڕووت بـەو جـامازەوە
بـــەو جـــاماز خـــاس پـــڕ جـــیازەوە
مەترسوون کـە نـام نـیکیت نـەنگ بـۆ
جەو بـابەت زووان بـا بـۆت لەنگ بـۆ
قـــەوم و قـەبیلەت گشت بـەدنام مـەبۆ
من جەوان بـەتەر ڕیسـوای عـام مـەبۆ
ئەر سـەد بـێماڵم بـێپارە و بـێپووڵ
مـــن یـــانە هـیچ کـام نـەدارۆ قـەبووڵ
هەر تا زندەنان جە ڕووی سەر بیسات
دایـــم وە مـــەیلت مـــەکـــەرۆ قـنیات
خۆفم هەن جە جەور چەرخ بێ ڕامـی
پـــەیدا بـــۆ پـــەرێت (ابـــنسلام)ی
ئـــەوسا دوبـــارە زامـــم خـــەتەر بـــۆ
ئـــی داخـــیچ وە بـان داخـان تـەر بـۆ

***

(٩)

## چراغم نەسەر

چـــراغـــم نـــە ســـەر، چـــراغـم نـە سـەر
هەر من نیم سـەودای عـەشق تـۆ نـە سـەر

قـێبلەم گشت عـاڵەم جـە مـن زیـادتەر
نـەسەودای عـەشقت وێـڵەن دەربـەدەر
وە هـەرجـا مـەشۆن هـەر بـاس تـۆ بـێ
هـەر کـەس دیـم نـە فکـر هـەراس تـۆ بـێ
نـامت نـە دەفـتەر دڵـبەران تـاجەن
شـاهان حـەسرەتمەند، گـەدا مـوحتاجەن
چـەن مـوسڵمانت وەنـاحەق کـوشتەن
نـیگات نـە جـەرگ چـەند بـێدڵ نـیشتەن
چەند مورشید شەیدا، چەند سـۆفیان مـات
ماتن نە سـەودای عـەشقت گشت خـێڵات
«فەقێ»ت رسوا کـەرد، «مـەلا» سـەرگەردان
«دەروێش» دڵـرێش وێـڵەن نـە هـەردان
پـەروانـە دەسـتوور بـولبوڵ شـەیداتـەن
دڵـەی دەردەدار هـەر نـەسەوداتـەن
قێبلەم چون تەسویر تەرسای جـام جـەمین
شـێخ «سـەنعان»ت وەرگـەڕا جـە دیـن
خـوداوەنـد ئـەو ڕۆ حـوسنێ وە تـۆ دا
سـۆفیان سـاف گشتدا وە کـۆدا
جە چەمەن هەی داد، نـە سـەحرا هـەی ڕۆ
داد و بـێدادەن گـرد نـە دەس تـۆ

نــە خــێڵان غــەوغا، نــە شــاران شــۆرەن
هەر کەس دیم هەر دیم تۆشەش زەروورەن
ئــەر فــەرهاد ئــەر قــەیس بــزانــان خــەبەر
دووبارە جە خــاک «ئــەڵحەد» مــەدان ســەر
مــــەیۆن وەی غـــــەوغای قــــیامەتەوە
وە ســـــــەیر بـــــاغچەی ئــــیقامەتەوە
تــا کــە زنــدەنان شــای شــەم جــەمینم
دێـــوانـــــە و غـــــەمبار دڵ مـــــاتەمینم

***

(١٠)

## چۆڵ نشینە خۆم

چـــۆڵ نشـینە خـۆم، چـۆڵ نشـینە خـۆم
چون «قەیس» مەجنوون چۆڵ نشینە خۆم
بـــەخت ســیاوشوم دڵخـــەمینە خـــۆم
مــەحرووم دیــدار دنــیا و دیــنە خــۆم
ئــەرامــەندەی دوور بــێ دیــانە خــۆم
ڕەفــیق وەحشــی وێــران یــانە خــۆم
ســـەرسام ســـادا زەدەی دێــوە خــۆم
پــا بــەست زەنــجیر مــەکــرو ڕێـوە خـۆم
دوور کــەفتەی وەتــەن هــەراســانە خـۆم
مەحرووم مـەجلس گشت خـاسانە خـۆم

سـەر تـاپا سـفتەی کـورەی نـارە خـۆم
دڵ پـارەی قـوڵلاب نـێش و خـارە خـۆم
قامەت خەمزەدەی ڕیسـوای عـامە خـۆم
شـەیدای بـێهوش عـەقڵ و فـامە خـۆم
وە تـیر تـانەی نـاکـەسانە خـۆم
دوسـتاخ هـەردەی کـوردستانە خـۆم
مـەحبووس زەنـجیر خـەیاڵانە خـۆم
مـایەی فکـر و هـۆش وە تـاڵانە خـۆم
ڕوو زەردی دیـوان هـامسەرانـە خـۆم
گـیرۆدەی مـەینەت دڵگـرانـە خـۆم
بێقەدر و قیمەت جە لای «نـاس»ە خـۆم
«تەن» لوخت و عوریان بێ کـراسـە خـۆم
گـیرۆدەی فـەرەنگ تـازە دیـلە خـۆم
کـەشتی شکسـتەی بـەحر «نـیل»ە خـۆم
مـایەی لاو بـەردی بـێ هـاوماڵە خـۆم
دڵ سـیاو قـەقنەس کـۆی زوخـاڵە خـۆم
شەرمەندەی عەشرەت سەرئەفکەندە خۆم
ڕووسـیای دەرمـاڵ خـودا بـەندە خـۆم

***

(١١)

## خەسرەو خەیاڵێ

خەسرەو خەیاڵێ، خەسرەو خەیاڵێ
ئاخ پەی خان خاس خەسرەو خەیاڵێ
صاحێب سپاوسان دارا ئیقباڵێ
موهەییا نە گەنج خەزێنە و ماڵێ
بەخشەندەی بێباک کۆی کەرەم بەیا
صاحێب شەوق و ذەوق دڵ بێ غەم بەیا
با ماوە شکار سەر دیاراندا
وە ماوای مەجنوون ڕۆزگاراندا
بدیا وە جەستەی خەم پێ وارامدا
وە کۆمەی دیوان وەحشی سارامدا
وە سەیل ئەسرین دیدەی تارمدا
وە دەرد دەروون ئەندۆبارمدا
وە عوریانی «تەن» تەنیای تاکمدا
وە سەنگ باڵین خەفتەی خاکمدا
وە سەرگەردانی سەحرای چۆڵمدا
وە عاسا و کەشکۆڵ پۆس کۆڵمدا
وە ئاە و ناڵەی شەوان تا ڕۆمدا
وە زاێەڵەی سەخت شین بێشۆمدا

وە پەشێوی بەخت شوومی چارەمدا
وە زوخا و زام جەرگ پارەمدا
وە بڵێسەی بەرز گڕ تیێ بەستەمدا
وە خەستەی خاتر خار جەستەمدا
بەزەییش باما وە جەستەی حاڵم
بزاناش کوشتەی کامین نەوهاڵم
جە کێوەن خاتر خەستەم گرتەن خەم
سفتەی سۆزانم چون پەروانەی شەم
سەرمایەی عەقڵم کێ کەردەن غارەت
کام دڵبەر بەردەن وە یەک ئیشارەت
بەڵێ ئەو خەیاڵ «نەوفەل» نە دڵ بەرد
گیان وێش هیلاک ژار قاتڵ کەرد
نەکەردا ئەو فکر ناوەردا نە دڵ
نەشیا نە سەودای خەیاڵ باتڵ
یا وە گەنج و ماڵ یا وە زۆر وێش
شاد کەردا خاتر دێوانەی دڵڕێش
بکەردا هیممەت چون خان «حاتەم»
«شەم» واسڵ وە من، من واسڵ وە «شەم»
هەر چەند مەوینوون نەی ڕۆزگاران
کەس نیەن دڵسۆز سیا ستاران

مەر هەرخوداوەند گوشایەندەی بـەخـت
ڕەها بدۆ بەخت من نەی بـەند سـەخت
وەرنـــە ئـــی بــەندە زەنــجیر پـــامەن
تا مەردەن چوو قـەیس وا حـەسرەتامەن

***

(١٢)

## داخ وەبان داخ

داخ وە بـــــــان داخ، داخ وە بـــــان داخ
دەرد وە بـــــــان دەرد، داخ وە بـــان داخ
جـــە داخ دووری شـــای بـــوڵەند دەمـــاخ
مـــن جــە گــەرمەسێر ئــەو شــی وە لێـڵاخ
جــەو پــەی داخـــینم تــا مــەرگ ســامان
یـــــــانە بـــــاوانش ئـــاماوە دامـــــان
ئیمساڵ نـەو وەهـار وەنـەم «دەیـجوور» بـێ
پەی چی؟ کە دیدەم جـە دیـدەش دوور بـێ
ئـــەو شـــی وە لێـــڵاخ چـــون بــێ بـەینەتان
مـــن مـــەندەن پـــەی دەرد سـزای مـەینەتان
تـــەرسوون جـــە بـــازی بـــازارِ گـــەردوون
جە کـەج نـەردی چـەرخ دەور دنـیای دوون
مـــەجنوون هـــاشت وە داخ سـزای دەردەوە
قـــاپی خـــەم نـــە بـەخت فـەرهاد کـەردەوە

یەک یەک هامسەران جە گیان بێزار کەرد
ڕۆی ڕۆشن جە عەین دەردینان تار کەرد
ئەو ئەردە وە بەخت قەیس و مەجنوون شەند
بەرد بنچینەش جە بنیاد هۆرکەند
مەتەرسوون جە بەخت منیچ بشانۆ
سزای ئەو یاران پەنەم بنمانۆ
ئێدیچ وە قسمەت (ابن‌سلام)م بۆ
من وەی دەردەوە دەور دنیام بۆ
یا شائی نەردە نشانیم وە بەخت
ئەر بۆ مەرگم بۆ وەرجە وادە و وەخت
مەرگم خاستەرەن من جەو ژیانە
جەی زندەگی پووچ شاد پەشیمانە

***

## (١٣)
## دڵ وەداخەوە

دڵ وە داخەوە، دڵ وە داخەوە
ئیمشەو خەریک بی دڵ وە داخەوە
جە داخ ئەو «شەم» شەوچراخەوە
تا ئاما باوێ جە ئێڵاخەوە
بادێ چوون نەسیم ڕەوزەی ڕزوانی
قووەت بەخش ڕۆح سەد ساڵ فانی

نــەسیمی نــەفەس «مـەسیح»ئـاسا بـێ
تــەسکین بــەخش زام دڵشــناسا بـێ
هەم شارەزای ڕای شای شەم جەمین بێ
دۆس پــەروانــان خــاطر خـەمین بـێ
شەمیمێ جە عەطر زوڵف شەم ئەو شەو
دانە ڕووی دەماخ پـەروانـەی بـێ خـەو
پـەرسام ئـەی نـەسیم سـوبخێز سـارا
دەماخ جە بۆی عەتر زوڵف «شـەم» دارا
دەوەنــدەی تـێژباڵ ســارا ســەیرانـی
ڕاهــنمای ڕەهــبەر ڕاگـەی حـەیرانـی
یە چۆنت زانـا مـن ئـیمشەو مـات بـێم
«پەروانە»ی پەشێو حەبس زوڵمات بـیم
کێ شــەمیم عــەتر «شـەم» نـمانا پـێت؟
ئەی بـۆ ئـاوەردی نـەسیم کـێدا پـێت؟
وات: ئەی پەروانەی پەڕ سوختەی مەلال
تەن خەستەی ئەیام خـوڕڕەمی ویسـاڵ
منیچ وێنەی تـۆ مـەعتووف «شـەم» بـیم
جە بۆی عەتر شەم دەروون پڕ غەم بـیم

***

(١٤)

## دڵە ماتەم بۆ

دڵــــە مــــاتەم بــــۆ، دڵــــە مــاتەم بــۆ

دەروونت وە دەرد کــــەسێ مــــاتەم بــــۆ

تۆ مەینەت کـێش بـی، ئـەویچ وە خـەم بـۆ

تــۆ چـون پـەروانـە ئـەو وێـنەی شـەم بـۆ

پەی کەسێ جەرگت جـە داخـان کـەیل بـۆ

تۆ «مەجنوون» خەیاڵ ئەو وێنەی «لەیل» بۆ

داخ پـەی کـەسێ کـێش داخـمان دیـار بـۆ

غــەمخوار و دڵســۆز تـا وە سـەر یـار بـۆ

نەک چون شەم بێ بێ خۆف بێ خودا و بێ پیر

ئــــەرها لە لێــڵاخ ئــەر جــە گــەرمسیر

هــیچ نــیەن وە قــەید جـەفا و جـەور تـۆ

جــەفا بــەردەی سـەخت سـزای دەور تـۆ

دڵــــە ئــــامانت دەســـــتم وە دامــــان

بـــەیۆ مــەکــێشە جــەفای بــێ ســامان

***

(١٥)

## دەلیل «شەم» نەدیت

دەلیــل شــەم نــەدیت، دەلیــل شـەم نـەدیت

جــــە لێــڵاخ ئــامای ســپی شــەم نــەدیت

ئـاهووی سـەر قـەتار نـەوای ڕەم نـەدیت
نـوور بـینایی هـەر دوو چـەم نـەدیت
نـازار بـاوان نـازئەندام نـەدیت
شـۆخ شـیرین ڕەنگ شـەکـەرڕاز نـەدیت
شـەم شـادی پـۆل پـەروانـان نـەدیت
خـان سـیامالْ گشت خـانان نـەدیت
خـاوێر خـالْدار خـوتەن خـۆ نـەدیت
مـایەی مـوشک ئـەرزان عـەنبەربۆ نەدیت
سـەر مـەنزلْ نـە سـای سـەهەندان نـەدیت
گـولْغونچەی گـولْبۆی گـولْخەندان نـەدیت
«وەنەوشە»ی بێ خەوش «سۆسەن»گولْ نەدیت
دەوای بـیماران، دەوای دلْ نـەدیت
زامـن نـە بـەرزی ئـێلاخان نـەدیت
وەتـەن نـە سـۆرگەی سـای زاخـان نـەدیت
سـەرسەوز و بـۆرچـین گـۆلاوان نـەدیت
نـازداران نـە پـای وەفـراوان نـەدیت
«نـیلووفەڕ» نـە مـەوج گـولاوان نـەدیت
نـەسرین نـە پـایەی شـەتاوان نـەدیت
«بـەڕەزا»ی تـاشان سـەرشاخان نـەدیت
جـەبین شـۆڵەی شـەوق چـراخـان نـەدیت

سەرقەتار ڕەم ئاهووی چین نەدیت
غەزاڵەی خوتەن نە ماچین نەدیت
شاباز شاهێن (شیروانی) نەدیت
صوراحی بێ گەرد دیوانی نەدیت
گوڵەندام شێوەی لەیلاتەرز نەدیت
سەردار ڕەندان بالآبەرز نەدیت
شای کەمەند وە پێڵ عوزرا تەور نەدیت
«هلال» کامڵ گۆشەی هەور نەدیت
دەلیل ئامانەن قبلەی من نەدیت
هەم ڕۆح هەم ئیمان دنیا و دین نەدیت
دەلیل ئامانەن ئامای جە لێلاخ
قبلەکەم نەدیت بەیۆ بێ دەماخ
دەلیل ئامانەن موژدە بدەر پێم
حالآت قبلەم ئیزهار ببۆ لێم
بزانۆم قبلەم وە شادی نیشتەن
سەرتاپاش وە نوور نەو «سوەیل» ڕشتەن
مەیل من پێشەن ئەو شیرین شێوە
وەی تەور من پەی ئەو شێت بووگم لێوە
یام خۆ نامەکەی بێ شەرتی وەندەن
وە تەحقیق دەندان دۆستیش کەندەن

مـەزانـۆ هـەم شـەرط وەریـن شکـەستەن
ئـەساسەی ئـەسباب بـەین نـۆش بـەستەن
سـەردی ئـێڵاخان مـەیلش کـەردەن سـەرد
سەردش جەو ئیقرار چـەنی ئـێمەش کـەرد
بـەین نـۆش بـەستەن دنـیاش بـە کـامەن
مـەیل و مـۆبەتش (ابـن سلام)ەن
بـەشق ڕای ڕاسـان دەلیـل یـە ڕاسـەن
ئـەر ڕاسـەن جـە مـن بـێزاریش واسـەن
ڕاس بـواچـە پـێم تـا دڵـنیا بـام
قـەیس ئاسا عـەوداڵ دەور دنـیا بـام
ئـەگـەر بـزانـۆم جـە مـن ویـەردەن
ئـیقرار کـەردەی ویش بـە جـا نـاوەردەن
مـنیش وە تـەحقیق مـەویەرووم جـە ئـەو
دەمـێ شـیم نـە خـاو ئـەوەدی نـە خـەو
چـونکە شـەرتی ویش نـەبەرد تـا وە سـەر
چـەنی ڕەقـیبان ویش کـەرد وە یـاوەر
پـەی مـن شـەرت نـیەن یـەک شـێوە خـاسی
ساحێب شـەرت و شـوون یـەک مـودبرماسی
شـەرت و وەفـاش بـۆ چـەنیم تـا وە سـەر
بـەینش دروست بـۆ تـا وە ڕۆی مـەحشەر

جــە مــن زیــادتەر مــەیل نــەدۆ وە کــەس
کـــلید گـــەنجش نـەدۆ بــە هــیچ کـەس
دڵ چـــەنی هــیچکەس نـەکــەرۆ پـابەند
هــــەر ڕۆژێ کــــەسێ نـەکــەرۆ پـەسەند
تــا نــامەی خــاسیش گشت کــەس بــوانــۆ
ڕەقـــیبان بــێ فــەهم هــەرزەش نــەزانـۆ
ئـــەبۆ بــــە ڕیشـــخەند هــامسەران ویش
تــیر تـــانەی تـــاڵ دایــم نـەدەن لێش
وەفــــاش تــا ســەر بــۆ چــون وەفــاداران
ویش نــــەکــا وە قــەڵب نــاڕەوای شــاران
جــە یــەک بــەدەن بــۆ ڕۆحش چــەنی مـن
ڕیشــەی نــەخڵ عــەهد نــەکـنیۆ جــە بـن
بــــەڵکم جــــە ئــەلتاف جــەمین جــامش
جـــە بــێخ شــەوبەند خــەیاتەی خــامش
«ڕەزا»ی بــــێچارەی دێـــوانـــەی دڵـڕێش
خەڵاص بۆ جـە دەست جـەفای ئێش و نێش

***

(١۶)

## ڕیسوای زەمانەم

ڕیســـوای زەمـــانەم، ڕیســـوای زەمـــانەم
«قــەیس» قــەدیمی ڕیســوای زەمــانەم

«پـەروانـە»ی پـەشێو سـەحرای وێـرانـەم
عـــەبداڵ بـەرگێڵ بـێزار جـە یـانەم
«جوغد» خـانە چـۆڵ شـەوان بـێ خـاوم
تـــەن تـەنیای مـەلوول دیـدە لێـڵاوم
هــەراسـان نــە دیـەی دیدەی یـارانـم
دیـــدەوان دەیـــر ســـەر دیـارانـم
بـــێزار جـــە زامــەن بـێزیای دۆسـم
شـــەو تـــا ڕۆ نـــە فکــر کـەدو کـەڵپۆسم
عەسای خەم وە دەس «خەمر» خەم نۆشم
لێـــوەی لەنگ لاڵ لۆنگ خـــەم پـۆشم
ســـزای ســـتەم کـــێش سـیاستارەم
«فـەرهاد» کـۆکـەن مـەنزڵ مـەغارەم
ڕای شەش‌دەر وە بەخت سیا دەربـەستەم
پەشیمان جە گشت پەشێـو حاڵ جـەستەم
جـفت چـەمیدە چـەرخ چـەپگەردم
دەردەدار سـەخت دوور جـە هـامدەردم
«تـــەن» ســیاچڵۆسک سـەردیارانـم
سـفتەی شـەماڵ گـڕ کـۆی ئـایرانـم
دڵ ئـازوردەی زوڵـم زەمـانەی زشـتم
چـەرخ کـەمان پشت شکـەستەن پشـتم

شـــەو دیـــدە بـێ‌خاو ڕۆ بـێ‌قەرارم
گـــرفتار جـــەور ڕۆی ڕۆزگـــارم
بـــێزیا جـــە ژیـــن رازی وە مـــەرگم
سەد جار نێش خـار هـجران بـە جـەرگم
چـەمەڕای خـێڵان ڕیسـوای هـۆزانـم
بـە ئـاهر عـەشق شـەخصی سۆزانـم
گـــرۆی وەحشـــیان بـــیابان گـێڵم
«قـــەیس» تـانەکـێش بـینایی لیـڵم
دڵ پەروانەی عـەشق شـەم ڕوخسـارێکم
پـــێکیای پـــەیکان دیـدەی یـارێکم
«حـــاتەم» خـەیاڵێ قـاتەن نـە بـارەم
بـــزانـــۆ وە حـــاڵ دەرد بـێچارەم
چـون نـەوفەل بـەیۆ نـە مـاوای هـەردان
بـــــاوەڕۆمەوە وە لای هـــامدەردان
بـەڵێ جـە وەسـواس شـەیتانی دوور بـۆ
چون حاتەم خاتر خـوداش مـەنزوور بـۆ
گـوشاد کـەرۆ دڵ خـەمناک خـەستەم
شاد کەرۆم بە وەسڵ ئەو ئـاوات وەسـتەم
مـەر مـەولای غـەمخوار بسـازۆ کـارم
وەرنـــە بـــەردابـەرد ڕۆی ڕۆزگـارم

***

(١٧)

# زوهرەی سوبسەڵات

زوهرەی سوبسەڵات، زوهرەی سوبسەڵات

زوهـــــرەی وەقت ڕۆ وادەی ســــوبسەڵات

پـێش‌ڕەۆ خــاوەر کــۆگــای خـەم خـەڵات

هــــــەرگیز نــــەوینی قــــیبلەی دوور وڵات

تــۆ خــۆ نــە زومــرەی سـەعد ئـەختەرانـی

تــــەماشاچی حـــوسن پــاک نــەزەرانــی

فــــێشتەر نــــەزارەت وە ڕووی پــاکــانەن

تــــەماشات وە شــــەوق شــــەرەفناکــانەن

هــەر ڕۆ ســوبح چــارەی ســافان مــەوینی

مــــیوەی نـــۆ جــەڕەنگ پــاکــان مــەچینی

ســــیرەت و ســــوورەت تــــەتارانــــەوە

وە نــــــــوور جـــــەماڵ نــــازارانــــەوەن

تا خۆر نە ڕووی بـورج بـەرمەشۆ چـون تـەیر

نە گوڵباغچەی حوسن پـاکـان مـەکـەی سـەیر

هـــــەرگیز مـــــەوینی نـــوور دیـدەی مــن

شــــەم شــــادی و زەوق بــەرگوزیدەی مـــن

نــە ئــەو جــە زومــرەی جــەمین ســافانەن

شــــەم ســـۆی چـــراغ عـــێڵ جــافانەن

فـیدات بـام سـەد جـار زوهـرەی وەقت ڕۆ
تـــۆ بـەو مـەمانی ئـەو بـە شـێوەی تـۆ
چـون نـەکـەردت سـەیر ئـەو مـەلەک چـارە
تـەماشای ئـەو حـوسن مـەر وە تـۆ عـارە

***

(١٨)

## سەنگ هەواران

ســـەنگ هـــەواران، ســـەنگ هــەواران
ســـەنگ ســـیاڕەنگ سـفتەی هــەواران
مـەلوول مـاتەم پـەس مـەندەی یـاران
چــون مـن هـام شـەریک دەرد و پـەژاران
تـــۆ ســەنگ کـۆنی یــە کــام هــەوارەن
یــە پـەی کـێ ڕەنگت ئـازیەت بـارەن
سـفتەی سـەودای عـەشق کـامین نـەوهاڵی
بـــێ دەنگ بـــە دڕەنگ مـــات مــەلالی
تـــۆ جـــە داخ کـێ سـفتە سـۆزانـی
پـەس مـەندەی هـەوار کـامین هـۆزانـی
ڕاس واچــە هـجران کـێت نـە دڵ داخـەن
جـــە هـــجران کـێ بـەرگت قـەڵاخەن
سەنگ وات سـیابەخت سـتەم کـێش خـەم
«پەروانە»ی پەشێو دوور کەفتەی پای «شەم»

مـــەر نـــمەزانــــی لێـــڵاویت لێـڵەن
نـە ئـی‌جا مـەسکەن گـوزەرگای خـێڵەن
یــــوورت چــەراگــای خــێڵ جــافانەن
جــای عــەیش و نشــات عــەنبەر نـافانەن
هــەوارگــەی رەویــڵ خــێڵ مــورادیــەن
مــاوای شــەوق و زەوق زومــره شـادیەن
مــــن هــەوار شــەم شــای پــەروانــانم
خــــــان خــــاڵخاسان ســــیایانانم
پــــاییز کــــۆچ خــێڵ بــیان وە دامــان
تــــەشریف بــاوەران وەی زێــدو زامــان
من سفتەی ئەو شەوق شۆڵەی شـەم چـارەم
داخــــێن ئــەو نــوور ســەحەر ســتارەم
ئــێد کــە واتش پــێم ســەنگ هــەواران
مــن جــە ئــەو بـەتەر لاڵ بیم جـە زبـان
زانام سفتەی شەوق ئـەو شـەم ڕوخســارەن
داخــــدار داخ‌مــای دەست ئــەو یــارەن
منیچ جـە هـجران شـای شـەم ڕوخسـاران
بـــا بــیم وە هــامڕەنگ ســەنگ هــەواران
تــــەن چــون ســیاسەنگ هــەوارانــمەن
پــــادشای خـــەمکێش خــەم دارانــمەن

***

(١٩)

## شای سیاسانان

شـــای ســیایانان، شــای ســیایانان
دەلیــل شــۆ وە لای شـای سـیایانان
شــەمع شــەوانــەن بــەزم پـەروانــان
دەلیـــلەی قــەتار دیــدە قــەترانـــان
ئاهووی بێدی گێڵ سـایە پـەروەردەوە
هەزارێ چون مـن جـە داخش مـەردە
واچە گۆش نـەدۆ بـە حـەرف ئـەغیار
مــن بــەو شــەرتەنم کـەردەنم ئـیقرار
سەر هەر نە سوودێ عەشقش بازیشەن
دڵ هــەر نــیشانەی تـیرئەندازیشـەن
پـام بـەو دامـەوە هـەر مـەبۆ لەنگ بـۆ
خــاتر وە نــێش هـجرانش تـەنگ بـۆ
تا ڕێزۆم وە خاک ئەڵحەد سەرای گـڵ
شەرتەن دڵ وە ئـێش زامش بـدۆ چـڵ

***

(٢٠)

## شەو بێدارانم

شــەو بــێدارانــم، شــەو بـێدارانـم
ڕەفــیق نــاڵەی شــەو بــێدارانــم

جوغد جا نە سەنگ سەر مەغارانم
یا هووکێش جەور ڕۆزگارانم
پەروانە پەشێو سفتەی نارانم
چون قەقنەس زوغاڵ کۆی دەندارانم
سەییاد بێ سوود سەر دیارانم
سمکۆی لەنج عەشق ناز تەتارانم
گیرۆدەی سەرچەنگ جەفای خارانم
خار خەم نە جەرگ خار خومارانم
پادشای گشت پۆل هجران بارانم
وێڵ وادی گرد هەردەی هارانم
هەراسان نە دین دیدەی یارانم
مەجنوون بەڕگێڵ پای کۆسارانم
هیچ کەس نەمەندەن جە غەمخوارانم
بپەرسۆ هەواڵ وێنەی جارانم
دیار دیارەنی مەینەت بارانم
بزانۆ وە شین ئاهر وارانم
دەردێ مـن گرتەن غەمگوسارانم
مەرهەم جەی وەر قەیس ڕۆزگارانم
جەی دەرد ساکن سەر دیارانم
مونتەزر وە لوتف بینای کارانم

***

(٢١)

## شیرین بەستەوە

شـــیرین بـــەستەوە، شـــیرین بـــەستەوە
شـــیرین ئـەساسەی سـەروێن بـەستەوە
دەست ئـــاوەرد وە زوڵـف سـیادەستەوە
پەخشان کەرد وە ڕووی دیدەی مەستەوە
گـوڵاو کـەرد وە جـام جـەم ئـیظهارەوە
چون توڕڕەی «تـەیموور» وە تـۆمارەوە
پـەرچـەم وە پـەرچـین قـەیچی کـارەوە
پـــەخش وە پـــێشانی خـــور ئـــێوارەوە
ئـــــەبرۆان وە ســــەیف قــەزارێــزەوە
وە دەور دیـــــدەی ئـــــاهوو بـــێزەوە
مـــوژگانش وە نـــێش سـەودای نـێزەوە
هـــا وە هـوون شـای ئـەو «پـەروێز»ەوە

***

(٢٢)

## سەییاد نامت بام

ســـەییاد نـامت بـام، سـەییاد نـامت بـام
تــۆ نـامت چـێشەن؟ فـیدای نـامت بـام
سەد جار وە سەرگەرد دەست و دامت بام
ڕەحـــمەت بــەیۆ پـێم تـا غـوڵامت بـام

مــن پــەروانــەی وێــڵ وادی وێــرانــەم
مەجنوون چۆڵگــەرد ڕیسـوای زەمـانەم
شــــەوان تــا وە ڕۆ جــە غــەم دارانــان
ڕەفــیێق هــامڕاز وەحشــی ســارانــان
عــــەبداڵ بــــەڕگێڵ بــێدی مــەکــانم
جەفا و مەینەت کـێش زەردەی هـیجرانـم
ســزا و ســتەمکێش غــەم نــە دەروونـم
هەردەی (تەبەس) گـێڵ ئـاوارەی تـوونم
چەندێوەن جە دین شای شەم دوور کەفتەم
سـفتەی ئــاهرناک ســاتێ نــەسرەفتەم
هەر وەحشی نە شکـڵ شـێوەی دۆسـمەن
ڕەفـــێق هـــامڕاز عــاسا و پــۆسمەن
مــن زەوقــم وە دەنگ نــاڵەی ئـەوانـەن
قـــنیاتم وە دیــن دیـدەی ئــەوانــەن
دوور جە دیدەی دۆس مـن بـەوان شـادم
تـــا ئـــەو ڕۆ گــەردوون بــدۆ مـرادم
ئــەی وەڵـەدەی شـۆخ تـۆ گـرتەن نـە دام
جە شکـڵ و شـێوەی قـیبلەی مـن تـەمام
نــــیم نگــــاش نــە دڵ نــاوک شــانۆ
دیـــــدەش وە دیــــدەی قـــبلەم مـــەمانۆ

فــیدات بــام ســەد جـار سـەیاد سـارا
بــەخشش وە بــەندەی خــەم پـیٚدا وارا
ئــــازادش بکــــەر ئــــامان جــە دامت
یــە خــەیلیٚ نـەنگین مـەبۆ پـەی نـامت
ئەو وەڵەدەی وەحش ئـازاد کـەی جـە دام
ئــــینشاڵڵا جــە دوو دنــیا ویٚــنی کــام

***

(٢٣)

## تەیران تیژباڵ

تــەیران تــیٚژباڵ، تــەیران تـیٚژباڵ
قــازان قــوڵەنگان تــەیران تـیٚژباڵ
خۆزگە پیٚتان بۆ جەی ماواو مەحاڵ
مەشدیٚ وە لیٚڵاخ بەند سەر سـاراڵ
مــەگـیٚڵان کـاوکاو بـەند لیـٚلاخان
یوورت چەراگای بوڵەند دەمـاخان
مــەوینان وە چــەم سیاماڵ خـیٚڵ
مشکین کڵافان کۆی کەتوون وە پیٚڵ
پــۆل پــەری ڕەم تـایفەی جـافان
نــازک نــازداران عــەنبەربۆ نـافان
تەمام نازاران واشـتەد کـەژ وەدۆش
دیــدە مــودبران بـەرگ داراپـۆش

یەک یەک خاڵخاسان خێڵ مـرادی
جە ئێڵاخ چەنی قـیبلەم وە شـادی
مــەگــێڵان وە فـەرق سـیاماڵاندا
مەدیان وە خێڵ سـۆسەن خـاڵاندا
درێـــغ مـنیچ تـەیر هـەوایـی بـیام
چەنیشان بـەو زێـد تـا ڕاهـی بـیام
چێگە تا ئەو زێـد بـنیشتام وە بـاڵ
شاد بیام بەو زێد بەو ماوا و مەحاڵ
تــا قــیبلەم چـەنی پـۆل ڕەوێـڵان
بــدیام وە سـەردەم تـەتار خـێڵان

***

(٢٤)

## قیبلەم خاوم بۆ

قــیبلەم خـاوم بـۆ، قـیبلەم خـاوم بـۆ
ئـەگـەر وە بـێ‌تۆ یـەک‌دەم خـاوم بـۆ
ڕۆ جەفا و مەینەت شەو ئـاراومـم بـۆ
وە چـــنگ گـــیان کـــێش گـلاراوم بـۆ
غـەیر جـە دیـن تـۆ ئـەر پـەژارەم بـۆ
پەژارەی پـڕ خـەوف ڕای قـەنارەم بـۆ
ئــەر لادێ فکـرت بـەر کـەرۆ نـە دڵ
جەرگم لەت‌لەت بۆ بـە مـەودای قـاتڵ

ئەگەر سیوای تۆ کەسیۆەم فەرد بۆ
سەر تا پام پەشتان ئالوودەی دەرد بۆ
ئەر لەحزەی نامت فەرامۆشم بۆ
یا سۆز سەودای تۆ خامۆشم بۆ
زووانم پارەی تێغ ئەڵماس بۆ
دەروونم لەت لەت گشت وە پڵاس بۆ
دیدەم وە دیدەی مەست سیۆەنگت
ئەگەر یەک نەفەس نەشنەوون دەنگت
مورغ ئەڕواحم جە تەن بێزارەن
دنیا نە دیدەم زوڵمات و تارەن

***

(٢٥)

## قیبلەم ڕێش نەبۆ

قیبلەم ڕێش نەبۆ، قیبلەم ڕێش نەبۆ
ئەر دڵ وەمەودای عەشقت ڕێش نەبۆ
ئەر تەن بەڵابار مەینەتکێش نەبۆ
ئەگەر دیدەم خار دووریت تێش نەبۆ
ئەو دڵ سیاسەنگ ئەو دیدە تار بۆ
ئەوتەن کۆنە کونج ماوای مەزار بۆ
سەرێ سەراسەر نە سەودات نەبۆ
گشت دەمێ نە گەرد خاک ڕات نەبۆ

ئەو سەر بێ سامان نە تەن جیا بۆ
خاموٚش غەڵتان خاک سیا بۆ
پایێ نەکەرۆ ئاموشۆ وەلات
دەستێ نەکێشۆ شەوو وڕۆ جەفات
ئەو پاگەستەی مار ئەفعی حەفت سەر بۆ
ئەو دەستە مەجروح زام خەتەر بۆ
زووانێ نە زکر سەنای تۆ نەبۆ
شەوو وڕۆ نە فکر دۆعای تۆ نەبۆ
ئەو زووان بێنوتق هەر وە پلاس بۆ
ئامین بڕیدەی تێخ ئەڵماس بۆ
من جە دووری تۆ شای شەم جەمینان
هەر کاتێ زانای لاشەم مەوینان

***

(٢٦)

## قیبلەم شەم مەبۆ

قیبلەم شەم مەبۆ، قیبلەم شەم مەبۆ
مەر هەر کەس چون تۆ نامش «شەم» بۆ
جەمینش چون بەدر دووهەفتەم مەبۆ
پەروانەش خەریک خار خەم مەبۆ

***

مەر هەر کەس باڵاش سەوڵ ساف مەبۆ
گێسووش پڕ جە عەتر موشک ناف مەبۆ
سەردار ڕەندان ئێڵ جاف مەبۆ
چون تۆ بێ مروەت بێ ئینساف مەبۆ
چون تۆ شەکەر لەب غونچە دەم مەبۆ
پەروانش خەریک خار خەم مەبۆ

***

مەر هەر کەس ئەبرۆش چون کەمان مەبۆ
زوڵف و خاڵ سێوەنگ چەم قەتران مەبۆ
وێنەی تۆ فیتنەی ڕووی زەمان مەبۆ
وێنەی تۆ بێ ڕەحم بێ ئەمان مەبۆ
بێ شەرت و بێ بەین مۆبەت کەم مەبۆ
پەروانەش خەریک خار خەم مەبۆ

***

هەر کەس پێشانیش پڕ جە نوور مەبۆ
ساق و گەردنش چون بلوور مەبۆ
مەلایکتەلعەت نەسڵ حوور مەبۆ
بێ پەروا جە ڕای «خودا» دوور مەبۆ
چون تۆ دەلیلەی لوای ڕەم مەبۆ
پەروانەش خەریک خار خەم مەبۆ

***

مەر هەر کەس چون تۆ لیمۆش کاڵ مەبۆ
سینەی سەدەف تا بووم لاڵ مەبۆ
نافناف غەزاڵ خوتەن ماڵ مەبۆ
نازار باوان چاردەساڵ مەبۆ
چون تۆ مۆبەتش مەردوم کەم مەبۆ
پەروانەش خەریک خار خەم مەبۆ

***

مەر هەرکەس وەشبۆش سا چون لەیل مەبۆ
موژانش نەگەرد سورمە کەیل مەبۆ
هەزار کەس نە ڕاش سەرتوفەیل مەبۆ
ناشی و نەزانحاڵ هەر بێ مەیل مەبۆ
شەوقش بە وێنەی سپی شەم مەبۆ
پەروانەش خەریک خار خەم مەبۆ

***

(٢٧)

## قیبلەم مەردەنم

قیبلەم مەردەنم، قیبلەم مەردەنم
ئامانت فەرزەن وادەی مەردەنم
نە حالات وەخت وەسیەت کەردەنم
نە ئاکام سەخت گیان سپەردەنم

وەسیەتم ئێدەن شای شەم ڕووخساران
بێ وە باڵینم چون بەینەت داران
بێخۆف و ئەندێش جە کەس نەکەی شەرم
هۆرداره پەردەی حجابت بە نەرم
نەپۆشی جەمین شەمس خاوەری
بۆوە زانۆدا چون ئەسمای پەری
بنیشە وە بان باڵینم وە ناز
بوانە سوورەی «یاسین» وە ئاواز
زووان بە ڕێزەی شەکەر ڕازەوە
دەنگ وە سەدای خاس وەش ئاوازەوە
جەمین وە عەرەق بۆ گولاوەوە
گۆنا و ئەگریجە و زوڵف خاوەوە
جەو عەرەق نە دەور گۆنای مەەپارە
جە سەر بتکیۆ بگنۆ وە چارە
تا دیدەم جە سەیر دیدەی سیات بۆ
نەزارە و نەزەر نازت زیاد بۆ
گۆش هەم وە سەدای ڕێزەی ڕازت بۆ
بەو سوورەی شەریف وەش ئاوازت بۆ
ئەر سەد جار «قابز» سزا بدۆ پێم
هەنی نیم وە تەنگ گیتن کێشان وێم

ئــەگــەر بــەو تــەور بــۆ ڕۆح ڕەوانــم
بــــیللا وە ئــــاسان بــــەرمەشۆ گــیانم
هـای چـە وەش مـەبۆ عـومر و زیـندەگـیم
نــە خــاک پــای تــۆ بکــەردام تـەسلیم
ئــەگــەر وە تــەحقیق ســەد کـۆ گـونامەن
ئـــینشەاڵــڵا بـەهەشت هـەشتەمین جـامەن

***

(٢٨)

## قیبلەم مەلال بۆ

قــیبلەم مـەلال بـۆ، قـیبلەم مـەلال بـۆ
دڵێ غەیر جە خـەم خـاڵت مـەلال بـۆ
ئەو دڵ ئەر دانـەی شـەوچرای لاڵ بـۆ
تــۆ خـودا بـازەش بـا وە زوخـاڵ بـۆ
دیــــدەم دیــدەیی نــەوینۆ بــاڵات
هــــەردەم نــەڕژیۆ وە گــەرد پــاڵات
ئەو دیدە دیـدەی جـەیر تـوندخێز بـۆ
تــۆ خـودا بـازەش بـا سـۆما بێز بـۆ
ســــەرێ وە ســـەر کــەمان هــەر ڕۆ
شـــەوان سـەر نـەدۆ وە ئـاستانەی تـۆ
ئەو سەر ئەر سەردار دەوران دوون بـۆ
تـۆ خـودا بـازەش بـا سـەرنگوون بـۆ

دەسیٚ دەس نەدۆ نـە کـەمەر پـەیوەس
نەشۆت نە گەردەن پەیاپەی دەس دەس
ئەو دەسە ئـەر دەس جـەللاد مـۆڕ بـۆ
تۆ خودا بازەش بـا بـەستەی گـۆڕ بـۆ
پـــایێ پـــەی پـــەیڕەو تـۆ نـەبۆ وە پـا
وە ڕای یـــــانەی تـــۆ نـــەشۆ وە ڕاڕا
ئەو پا ئەر پـای پـاک بـەدر مـونیر بـۆ
تـــۆ خـــودا بـازش بـا نـە زەنـجیر بـۆ
قـــیبلەم بـــا دەســـم وە دامـــانت بـــۆ
مەجزووب جە زومرەی غوڵامانت بـۆ

***

(٢٩)

## کەلب کۆی یارم

کـــەلب کـــۆی یـــارم، کـــەلب کـــۆی یـــارم
کـــــەلب پـــــاسەبان ئـــاسانەی یـــارم
ڕەفــــــیٚق هـــــامڕاز دۆس دڵـــــدارم
خـــاک پـــات وە بـــان دوو دیـــدەی تـــارم
تـــۆ خـــۆ نـــە وێـــنەی وەفـــا کـــێشانی
غـــــەمخوار دڵســـــۆز گشت دڵـــــڕیشانی
کـــــەلب خـــــانەزای بـــــاوان دوســـــی
دڵگـــوشای یـــاران مـــەجنوونی پـــۆسی

مـــەزانـــۆ قـــیبلەم هـەر وە دەست وێش
پـەروەردەت کـەردەن تـا نـەبی دڵـڕیش
ئـــەگـــەر ئـیشەاڵـڵا قـەسد سـەرت بـۆ
ڕۆ جـــە ڕۆ ســـزای بـــەد بـــەتەرت بـۆ
خــــەیاڵم نـــــەبی جـــــە وەفـــاداری
تۆ جـە ئـاسانەی دۆس دەس‌هـۆرداری
سەبەب چێش بەی‌تەور هـام‌دەرد دەردم
جـــە بـــاتی یـــاران گشت قـەوم فـەردم
تۆ جـە ئـاسانەی دۆس دوور کـەوتەنی
چـــۆنەن قـــەرارت چـــۆن ســـرەوتەنی
چــــۆنەن ئـــاراگـــێڵ وێـــڵ شـــارانـــی
هــــــەر مــــوسافری ســــەر دیـــارانـــی
سەگ وات سـتەمکێش زەمـانەی نـاهاڵ
«پەروانە»ی جەمین شۆخ «شەم» جەماڵ
مـــــەر لێـــــڵاوەنی بـــــینابیت کـــۆرەن
مــەر ڕەزای مـن بـێ یـا دەست زۆرەن
بابۆی «شەم» هەوای بەغدا شـارش بـێ
پەی پـەس گـەلەش مـن دەرکـارش بـێ
وە زۆر ئـــــاوەردش هـــەر وە بـــێ ڕەزا
تـــا گـــورگان گـــەلەش نـەکـەران غـەزا

بـــە گـــۆسفەندان بـــا بـــۆی دۆســـتەن
ڕەفـــێق هـــامڕاز عـــەسا و پـــۆستەن
وەرنـــــە جـــە کـــۆ بـــێ وە بـــێبەهانە
بگـــــێرۆن جـــــە بـــــەر ئـــی بـــیابانە
ئـازیز بـە فـدای کـەلب وەفـادارت بـام
فـــرستادەی ڕای بـــەغدا شـــارت بـــام

***

(٣٠)

## گوڵەن، چەمەنەن

گـــوڵەن، چـــەمەنەن، گـــوڵەن، چـــەمەنەن
وە مـــەیلت دیـــدەم گـــوڵەن، چـــەمەنەن
وەهارەن، سـەوزەن، ئـاوەن، پـای کـاوەن
هـــاژەی وەفـــراوان شـــاخەی شـــەتاوەن
تـــەمەن، دووکـــەڵەن، گـەردەن، غـوبارەن
فـرمێسکەن، چـەمەن، سـەیلەن، فـووارەن
سەنگەن، کـۆسارەن، سـەرکوەن، هـەردەن
وەنـــەوشەن، شـەوبۆن، گـوڵەن، بـاوەرەن
سەرعیەن، شەیدان، نەجدەن، مەجنوونەن
فـــیراقـــەن، وەســـڵەن، پـــیاڵەن، هـوونەن

***

(٣١)

## مەحبوب جافان

مـــەحبووب جــافان، مـەحبووب جـافان

مـــەحبووب بـــێعەیب تـــایفەی جـافان

ســـــەرقەتار ڕەم عـــــەنبەربۆ نـــــافان

ســـــەرکێش ڕەوێـــڵ مشکـــین کـــڵافان

ئـــاهووی مـــودبرماس مـەکـان نـەهەردە

چووزەی ســونبوڵچر نـەسا سـڵ کـەردە

خـــاوێر خـــاڵدار خـــەتاو خـــۆتەن مـاڵ

تـــــەتار تـــایف شـــۆخ شـــیرین خـــاڵ

وەتـــــەن نـــــە زامـــن ســـەربەرز لێـــلاخ

ســـــەیر ســـــەرکۆان ســـــەییادان و داخ

چەرخ چەم سیاچەم چوست وچالاک پڕ

شەیدای شکـاردۆز چـنگ و هـووناو بـڕ

لاچین شەشدانگ سـەحەر جـە لان خـێز

شـــــمقار تـــــێژباڵ تـــەیر تـــوندگورێز

شـــــەمع شـــا پـــەسەند گشت ســیامالان

نـــام تـــۆ نـە بـەزم خـەسرەوان خـوانـان

بــەو شـەوق جـەمین شـەم ڕوخســارەوە

کـــــێت نــــەدا وە دەم کـــزەی نـــارەوە؟

بـــەو قـــاش قـــەتران دڵ پـــێ ئـــێشاوە

ســـــتوون یـــانەی کـــێت نـــەکـــێشاوە؟

بەو دیـدەی ســای ســورمەسای سێوەنگ

موژانت وە هوون کـێ نـەکـەردەن ڕەنگ؟

بـــەو نـــیم‌نیگای نـــاز بـەو لەنـجەو لارە

ئـــاخر جـــەرگ کـــێت نـەکـەردەن پـارە

بـــەو بـــاڵای نـــەوتووڵ وە نـــەورەستەوە

بـــەو کـــۆکـۆی کـڵاف دەسـتە دەسـتەوە

واچـــــە دڵ کـــێت نـــەستانان وە زوور

ئـاخر یـانەی کـێت نـەکـەردەن خـاپوور

❊❊❊

(٣٢)

## وەڵامی نامەی «ڕەنجوری»

لە لایەن «وەلی دێوانە» وە

مـــەولای لاڵشـــناس، مـــەولای لاڵشـــناس

مـــــەولەوی ئـــــەولەوی دانـــای لاڵشـــناس

هــەیاس دوڕنـــاس ئـەسڵ و نـەسەب خـاس

نـــــەژاد پـــــاکـــــان، «نـــــظامی» قـــیاس

«فـیردەوسی طـووسی»، «جـامی» مـڵک جـام

«خـــــاقانی» خـــــەیاڵ، «ئـــەنوەر»ی ئـــەیام

«سەعدی» سوخەنۆدان بەحر مەعانی
«حافظ» (شیراز) «صائب» سانی
بەتای بێ‌هەمتای قەییووم بێ‌چوون
هەمتای تۆ کەمەن نە ڕووی دەور دوون
شەوکەت خووشەچین پەیدای مەعناتەن
عیسمەت نە ئەوساف سیفاتت ماتەن
مەولانا «زەهیر»، «فارابی»ی دەور
فوزەلای فازڵ نادرەی وەش تەور
هەنی چەند شەعرای ئاسف نیشانان
دەرس نە مەدرەسەی علم تۆ وانان
غەوواص موحیت دەریای عولوومی
شیعر مەسنەویت، مەر «مەولای ڕوومی»
تۆ شاڵڵا هەنی پایەت بۆ زیاد
من چێشم کە نام من ئاری وە یاد
غەرەز هەر ئێدەن بوزورگیت کەردەن
نام بەندەی وێت وە یاد ئاوەردەن
ئەڵبەت وێت وەحاڵ پەشێویم زانان
جە ڕووی ئیلتیفات نامەت کیانان
کەردەنت ئیزهار، مەولای کەرەم سەیل
تۆ ساحێب لوتفی یەعنی من بێ مەیل؟

مـــن قـــەسەم وە زات ئـــەو كـــەس يـــەگـانەن
دايـــــم نـــــام تـــــۆم ويـــــرد زووانـــــەن
هـــەر چـــەند وە خـــدمەت تـــۆ ئـــاشنا نـــيم
بـــــەڵێ جـــــە فكـــرت ســـاتێ غـــافڵ نـــيم
دڵ پـــــەروانـــــەوار جـــــە شـــەو تـــا وە ڕۆ
هـــــەر هـــانە خـــەياڵ وەســـڵ و ديـــن تـــۆ
مـــــن كـــە هـــامتەركيب عـــومرم نـــام تـــۆن
نـــيشات زەيـــــنم كـــــۆی كـــــەلام تـــۆن
نـــــاديدە حـــــوبيت جـــــا گـــرتەن نـــە دڵ
هـــــەرگيز جـــە ســـەودات دڵ نـــيەن غـــافڵ
كـــــەلامت ســـــەرمەشق ئـــينشای زەيـــنمەن
نـــــامت بـــــينايی هـــــەر دوو عـــــەينمەن
(لاتەشبيە) چون «وەيس» رموودەی «ڕەسووڵ»
هەر هـام نـە تـەحسيل وەسـڵت كـەم وسـووڵ
نـــەوا بـــــواچـــی جـــەو زامـــن دووريـــم
دێـــوانـــەی بـەندەی مـەولای «ڕەنـــجووری»م

***

## (٣٣)

## نازک بەدەن «شەم»

نازک بەدەن «شەم»، نازک بەدەن «شەم»
نازک لارە و لەنج، غەمزە و ناز «شـەم»

نازک لەب شەهد، شەکەر ڕێز «شەم»
نازک تەبەسسوم قەند ئامێز «شەم»
نازک گەردەن بەرز، باڵای بەرز «شەم»
نازک سینە ساف سەدەف تەرز «شەم»
نازک زوڵف دێز عەنبەرین «شەم»
نازک ڕیزەی ڕاز شەکەرین «شەم»
نازک قەوس قاش قودرەت‌ساز «شەم»
نازک باڵاسەوڵ سەرفەراز «شەم»
نازک دندانان گەوهەردانەی «شەم»
نازک نەقش خاڵ لووتەوانە «شەم»
نازک دوو بازو پەنجە و دەست «شەم»
نازک ئەنگوشتان حەنا بەست «شەم»
نازک پێشانی پڕ جە بەند «شەم»
نازک شێوە شۆخ شاپەسەند «شەم»
نازک زنج زەڕ زەنەخدان «شەم»
نازک شاماران وەبان شان «شەم»
نازک دوو قەندیل قۆرەت‌مەند «شەم»
نازک نازکی کەمەربەند «شەم»
یاشا هەر شەم بۆ تەور شێوەش بۆ
هەزار پەروانە چون من لێوەش بۆ

ئەسیر وە قەندیل شای نەجەفـماڵ بـۆ
بســۆزۆ بــاڵاش جــە زوبـان لاڵ بـۆ

***

(٣٤)

## نەدارون تانە

نــەداروون تــانە، نــەداروون تــانە
نــەداروون تــاقەت تـووانـای تـانە
وێنەی مەجنوون وێڵ دەیری دێوانـە
مەشم وە چۆڵ و تەرک مەکـەم یـانە
بەرگ تەن جە وەڵگ درەختان چـۆڵ
پەی ویم مەوازوون مەگێروون نەکۆڵ
تەنیا یەک سەنگێ مەنیوون وە بـاڵین
تەک مەدۆم پێـوە پـەرێ شـەو نـاڵین
خـاوم وە ڕاحـەت گـەشتم وە دڵـواز
نە نەزان ڕەفـێق، نـە ڕەقـیب هـامڕاز
پەی ویم مەگێڵوون سەرووەش نەکاوان
مەر مەلان مـەردەن بـێدیشان مـاوان

***

(٣٥)

## نە«شەم» جیامن

نە «شـەم» جـیامن، نـە «شـەم» جـیامن
«پەروانـە»ی پـەشێو نـە «شـەم» جـیامن
مـەجنوون بـەدبەخت چـارە سـیامەن
شـەم داخ حـەسرەت وە دڵ نـیامەن
قـەیس ئاسانە خـێڵ شـای شـەم مـەندەن
وێـڵ دەربـەدەر فـام پـەرکەندەمەن
تـەن تـەنیای بـێ کـەس یـانە بێدیمەن
گـون نـە گـێج بـەحر نـائومیدیمەن
سـیاتەر نـە سـەنگ هـەوارانـەمەن
عـەبداڵ بـەرگێڵ دیـارانـەمەن
مـەنزڵ نـە مـاوای تـوون تـەوەسمەن
جەفا و بـێسوود و ڕەنـج وە عـەبەسمەن
عـازاو مـەینەت سـەد کـۆ بـارمەن
پـەرێ دیـن دۆس ئـینتیزارمـەن
چـەنی وەحشـیان ڕۆ هـامڕازەمـەن
شـەو نـە شکـەنجە گـیرو گـازەمەن
چـەمەڕای ڕای دۆس لێـڵاخ نشـینمەن
بـە ئـەسر حـەسرەت دیـدە نـمینەن

هــەراســان نــە قــەوم بـێزار جـە زێـدمەن
دەست نـــە «شــەم» بـڕیا دڵ نـائومێدمەن
تا وە ڕۆی مەحشەر مات و مەحزوونمەن
سۆز سەودای عەشق «شەم» نە دەروونمەن

***

(٣٦)
## وەخاڵ تۆوەن

وە خـــــاڵ تـــۆوەن، وە خـــاڵ تـــۆوەن
نـــــوور لقــای حــەق وە خــاڵ تــۆوەن
شـۆڵەی شـەم وە شـەوق جـەماڵ تـۆوەن
دەردیــــــنان وە داخ کـــــەماڵ تـــــۆوەن
لەیـــــلێ کـــەنیزەک شـــیرین بـــەندەتەن
سەد «زلێخا»ی (میسر) وە زەڕ سەندەتەن
«هــومەیلا»ی زەریـف بـەڵقیسای بـاڵدار
گوڵشای گوڵئەندام «عوزرا»ی گوڵعوزار
یـــەکـــایەک حـــەیران بـــەژن بـــاڵاتەن
بـــــاڵای نـــــەونەمام ســـــەوڵ ئـــاڵاتەن
دڵ ئـــــارام دڵ ســــەمەن بــۆی پــەری
«مــەنیژە»ی بـیژەن، زوهـرە و مـوشتەری
خــەرامــان حــەیران حــوسن زێــباتەن
بــانوان تـــەمام گشت جــان فــیداتــەن

حـــووران جـــەنەت فـــریشتان فـــەرش
ســـەناخوانـــتەن جـــە زەمـــین تـــا عـــەرش
گـــــوڵ جـــــە گـــوڵستان وە داخ تـــۆون
داخـــــــداران وە داخ دەمـــــــاخ تـــــــۆون
هەر چەند پەروانان هەن جە سەحرا و کـۆ
گشت ماتەن جە شەوق شەم دەستوور تـۆ
من چون پەروانان هەر جـان فـیدای تـۆم
حـــەیران جـــەمین بـــەزم ئـــارای تـــۆم
وە ســەرگەردت بـام شـای سـپی شـەمان
ســـەرگەردان تـــۆم دوور جـــە هـامدەمان
بـــەشق خـــاڵ وێت خـــاتر شـــادم کـــەر
یـا ڕوخســەت یـا مـەرگ یـا ئـازادم کـەر
ئـــــیسە بـــــۆ چـــەنیم لادێ ســـازابـــە
جـــەی گشت عـــەزابـــە گـــەردن ئـازابـە

***

(٣٧)

## هامسەران تارەن

هـــــامسەران تـــارەن، هـــامسەران تـــارەن
ئـــــیمساڵ بـــــینایم تـــاریک و تـــارەن
ذەوق زیـــــــندگیم چـــــون ژار مـــــارەن
دنـــــیا جـــــە دیـــــدە (وادیالقَـــهار)ەن

گشت عالەم نە وەقت فەسڵ نەو وەهار
شاد مەبۆ وە زەوق گوڵان و گوڵزار
من ئیمسال وەهار شادیم ناشاد بێ
پەرێشان جە گشت ڕەنجم وە باد بێ
بولبوڵ شاد وە گوڵ من ڕەنجەڕۆ بیم
ڕەنجەڕۆ جە ذەوق وەهار نۆ بیم
ئیمساڵ نەووەهار فێشتەر جەساڵان
ڕازانش ڕەونەق ڕەنگ گوڵاڵان
هەردان، هەڵەتان، ساران، هەواران
خەیمە گوڵپۆشان خاستر نە جاران
من هەر گوڵزار نە دیدەم خار بێ
هەر سەوزە وەنەم وە ژار مار بێ
هەر چەمەن سەودای جوانیم جا کەرۆ
هەر لالە سەودای دەروون داخ کەرۆ
هەر شکۆفەی شەوق شێوەی «شەم» پێش بۆ
دیام وە پێش‌دا خاترم ڕێش بێ
وەهارێ وەی تەور خۆ جە لام دوور بێ
چەمان نە دیدەم نێش زەنبوور بێ
ئای خۆزگە وە ساڵ نەووەهار پار
هەر ڕۆ سوب سەحەر مەدیام باڵای یار

وەهـــار ئـــیمساڵ پـەشێو جـەستەنان
دوور جـە دنـیا و دیـن ئـانە خـەستەنان

***

(٣٨)

## هامسەران نامم

هـــامسەران نـــامم، هـامسەران نـامم
مـــن نـــامم گـــنۆ دێـوانـەن نـامم
جـــەو ســاوە ڕیســوای دەور ئــەییامم
ڕۆێــی، نـــەگــێڵا دەوران وە کــامم
جەو ڕۆ من جە «بەتن» مـادەر پـەیدا بـیم
مەجنوون کـۆگـەرد شـێت و شـەیدا بـیم
هـەر خـاتر خـەمین دەروون پـڕ داخ بـیم
هـــەر دڵگـــیر دەرد وێـڵ و دوسـتاخ بـیم
هەر چەم پڕ ئەسرین مات و مەحزوون بیم
هەر گێرودەی جەور جەفای گەردوون بیم
هـەر دایـم ڕەقـیب ڕەهـەندەی ڕاچـەفت
وەردا وە جـــەستەم ئــاهر چـەنی نـەفت
ئــەر صــەد سـزاکـێش بـار مـەینەت بـێم
بــەڵێ ســازا بــیم چــەنی بـەخت وێـم
ئـــی ساڵە ڕۆێـی جــە ڕاگــوزەر دا
شـــەم شـــێوە جـــە نـۆ ئـاهر جـێم وەردا

ئـەو وەی بـڵێسەم جـە گـەردوون ویـەرد
بیم وە کـۆی زوغـاڵ سـفتەم بـیوە گـەرد
پـــەروانـــە سـیفەت پڕ سـفتەی زوخـاڵ
سۆزان بیم وە شەو شـۆڵەی شـەم جـەماڵ
ئـــــاهر بـــەختم هـــەر نـــەبی خـــامۆش
تـــا قـرچـەی جـەرگم شـنەفتم وە گـوش
ئـەوەڵ چـون مـەجنوون وێـڵ سـارا بـیم
دێـوانـــەی دڵگـــیر جـــە خـەم دارا بـیم
ئــیسە پـــەروانـــەی پـــەڕ و بـاڵ سـفتەم
وێڵ بـەرداوبـەرد کـۆس و کـۆس کـەفتەم
هـــامسەران ســـفتەی شـــۆخ شـــەم لقـام
چـــۆن مـــەبۆ عـــلاج وە چـــێشەن دەوام

***

(٣٩)

## هەرمن خەمبارم

هـەر مـن خـەمبارم، هـەر مـن خـەمبارم
هـەر مـن خـەمینم، هـەر مـن خـەمبارم
هـەر مـن «پـەروانـە»ی «شـەم» نـادیارم
هـــەر مـــن سـەرگەردان زوڵـمات تـارم
هەر من سـتارەم جـە نـەحسی پـەستەن
هەر من ڕای شەش‌دەر نەردم دەربەستەن

هەر مـن چـون مـریخ خـارجـەن یـانەم
هەر من بـەدنامیم پـەخشەن جـە عـاڵەم
هەر من کوشتەی نێش عەقرەب ژارەنـان
هــەر مــن ڕیســوای دەور ڕۆزگـارەنان
هەر من زیج نـەحس کـەفتەن وە بـەختم
هــەر مــن ســزاکــێش ئـازار سـەختم
هــەر مـن «دەلو»ئـاسا نـە قـەعر چـاهم
هەر من چـون مـەجنوون چـارە سـیاهم
هــەر مــن ئــیقباڵم نــەردەن نــەدارەن
هەر من چون فـەرهاد کـۆکـەنیم کـارەن
هـەر مـن فـریشتەی دەوڵـەت خـامۆشم
هەر مـن چـون بـەهرام نـمەد وە دۆشـم
هەر من جە ڕای دین بـێزاریـم وەسـتەن
هەر من چون سەنعان زونـنارم بـەستەن
هــەر مــن جــە تـانەی ڕەقـیب نـاهاڵ
هەر من شادی و زەوق دنیام بـی بـەتاڵ
هــەر مـن پـەروانـەی پـەشێو حـاڵەنان
هـەر مـن شـەو تـا ڕۆ شـەم خـەیاڵەنان
هەر من جەو سـەبەب سـتارەی چـەفتم
هەر من شەم ئائین جە شەم دوور کـەفتم

هەر من وە بێ «شەم» گڕاگڕ گڕیام
زەنگ بەد نامی نە عالەم زڕیام
هەر من گشت پەی شەم خاترم ڕێشەن
هەر یاران عیلاج دەرد من چێشەن

***

(٤٠)

## هەرمن ناشادم

هەر من ناشادم، هەر من ناشادم
گشت عاڵەم شادەن، هەر من ناشادم
هەر من نەیاوان وە لای حەق دادم
هەر من نائومید قاپی مرادم
هەر من بازی باز نەردەن نە بارم
هەر من ڕای شەش‌دەر بەندەن نەچارم
هەر من ناسزان فەڵەک وە بەختم
هەر من گیرودەی ئازار سەختم
هەر من چەرخ چەپ وەنەم نە قینەن
هەر من تاڵەم پەست خاک زەمینەن
هەر من ستارەم سیا بێ نە سەر
هەر من فریشتەم کەفتەن دەر بە دەر
هەر من ئیقباڵم خاوێر خەفتەن
هەر من نە ڕووی «ئەرز» ڕای ڕاسم چەفتەن

هەر من خەمیدەی دەور گەردوونم
هەر من جورعەنۆش جام مەجنوونم
هەر من پەروانەی پەشێوحاڵ جەستەم
هەر من پەڕ سفتەی خەمناک خەستەم
هەر من چون بوڵبوڵ یەک فەسڵم وەسڵەن
هەر من سێ فەسڵ عومرم بێ ئەسڵەن
هەر من ڕۆی ڕۆشن وە دیدەم تارەن
هەر من زیندەگیم چون ژار مارەن
هەر من گرفتار جەور و عازاوم
هەر من پەرێ دۆس دیدە لێلاوم
هەر من سزاکێش دەرد و داخانم
هەر من چەمەڕای ڕای لێلاخانم
هەر من جە پەی دۆس لێلاخ نشینم
ها وەختەن بەرشۆ گیان شیرینم
تا ئەو ڕۆ کە خێڵ شیان وە دامان
من هام نە سزای جەور بێ سامان
مەر موشکڵ گوشا بدۆ مرادم
وەرنە تا مەردەن خاتر ناشادم

***

(٤١)

## هەور نەدۆ خەمین

هەور نەدۆ خەمین، هەور نـەدۆ خـەمین
تــۆ خـەم پـۆشەنی مـن خـاتر خـەمین
بــۆ تــا هـەردوومان دەردیـن مـاتەمین
ویـــڵ ویـــڵ بگـێڵین سـەراسـەر زەمـین
تۆ جە «سەما» سەیل، من جە «زەمین» ئاه
هەر دوو بکەریم ڕووی گـەردوون سـیاه
تـــۆ ســـەیل سـرشک دیـدەت وە زاری
ڕێـژان کـەر چـون تـاو سـەیل وەهـاری
مـــن جـــە زەمـــین ئـاه نـاڵەی نـەبەردم
بـــخێزۆ جـــە دڵ هـــەناسەی ســـەردم
تـــا بـــۆ وە تـوفان تـوف ڕەسـتاخێز
ســـیاماڵ نـــە بـــرج لێـــڵاخ بـــۆ گـورێز
خـــێڵخانان جـــە دوود ئـــاه ئـــیە و تـۆ
بـــیان وە دامـــەن گـــەرمەسێر جـــە نـۆ
تـــا کـــە کـــۆچ خـــێڵ جـــاف مـورادی
پـــەیدا بـــان چـــەنی قـــبلەم وە شـادی
ئـەو دەی گـەرمەسێر هـەم بـەیۆ وە فـەڕ
فـــەڕ گـــێرۆ جـــە زەوق تـەتاران «بـەڕ»

هـــەور نـــۆ بـەی‌تەور بســازیم وە یـەک
من جە ڕووی زەمین، تو نە ڕووی فەڵەک
هەر دوومان وە جەخت بگەڕێیم وە تاو
تۆف «زەمهەریر» پـەیدا کـەیم جـە نـاو
بـــەی تـــەور تـۆفانی بـاوەریم وە هـەم
تـــا خـێڵان نـە بـرج لێـڵاخ کـەران ڕەم
کـــۆچ کـــەردە مـــاڵان بـــیان وە لامـان
دامـــان بـۆ وە زەوق نـەوتووڵ نـەمامان
شاد بۆ وەی زامـن شـای شـەم جـەمینم
گـــــوشادی خــــاتر خـــار خـــەمینم
تا مـنیش وە دیـن دیـدەی ئـەو شـادبام
نـــە جـەور گـەردوون خـاتر ئـازاد بـام

***

(٤٢)

## هەی نائومێدی

هـــەی نـــائومێدی، هـــەی نـــائومێدی
هـــەی ڕەنـــجەڕۆیی، هـــەی نـائومێدی
هەی یاران چون من بـەدبەختێ کـێ دی
پەی هاڵ نەزانـی ڕووم کـەرد نـە بـێدی
چۆڵان تەی کەردم «جەبەڵان» یـەکســەر
جە تووس و توون بـیم یـاوام وە تـەبەر

هەردەی نەجد قەیس گشت دام وە پاوە
پەروانە دەستوور سەر وە سەوداوە
یاوام بەو زامن ماوای قیبلەم بێ
مەکان و مەسکەن گوزەرگای «شەم» بێ
هەوران چۆڵ دیم زامن وێرانە
بایەقوش بەستەن جەو مەسکەن لانە
نە دەنگ دەیار نە سەدای یارەن
دەنگ وێرانە (وادیالقَهار)ەن
پەرسام بایەقوش هامدەرد دەردم
ڕەفێق هامڕاز ناڵەی نەبەردم
من «پەروانە»ی وێڵ وڵگەی دامانم
جانشین «قەیس» شای کەم فامانم
کۆشی کۆچ لەیل شای شەم جەمینم
گوشادی خاتر خار خەمینم
بایەقوش واتش: «پەروانە»ی کەم فام
ئیسە ئامانی وەی ماوا و مەقام
کۆچ خێرش کەرد لوا وە لێلاخ
پەی من حەسرەتمەند پەی تۆ ئاخ و داخ
وە ئیقباڵ نەحس وێم دامامەوە
نائومێد جە شەم هەم ئامامەوە

یـــاران هـــامسەران نـــائومێد وێـم
هەی عەبداڵ «بەڕ» دوور جـە زێـد وێـم

***

(٤٣)

## هەی هەی ناسۆرەن...

هەی هـەی نـاسۆرەن زامـانم ئـیمشەو
گوڵگۆنەن جە زووخ دامـانم ئـیمشەو
کــۆن تـەبیب بـدۆ دەرمـانم ئـیمشەو
بــە دەرد «ئـەییوب» گـریانم ئـیمشەو
گەرمەن بـازارم چـەنی دەرد ئـیمشەو
سوود سەودامەن چەنی هەرد ئـیمشەو
هـەی یـاران بـڕیان حـەیاتم ئـیمشەو
چون خزر خەریک زوڵـماتم ئـیمشەو

***

(٤٤)

## یاران سافێکم

یـــاران ســافێکم، یــاران ســـافێکم
لێــــــویای لێـــوە لاڵ ســـــافێکم
شەیدای شەوق «شـەم» پـڕ شـەفافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جـافێکم

***

خار خەم نە جەرگ حـاڵ خـومارێکم
گــیر و گــاز عــەشق بـاز تـەتارێکم
پـێکیای پـەیکان مـەروان ژارێکـم
ســەرسام سـادار پـەری تـارێکم
لەرزیـــای لەرزان تـــوول تـافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جـافێکم

❊❊❊

عــەبداڵ بـێ مـاڵ جـام جـەمیئێکم
پەشێو حاڵ جـەستەی دڵ خـەمینێکم
ئاشوفتەی دەستەی زوڵف پەڕچینێکم
مــوبتەلای قـیبلەی دنـیا و دیـنێکم
مــایل وە مـۆبەت بـێ ئـینسافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جـافێکم

❊❊❊

زامــــدار زەدەی دام شـــــەستێکم
زەلیــــل زامــەت زەدەی دەســتێکم
ڕۆح جە دەست پەرواز موژە مەستێکم
ئــاماج تـانەی خــاس گـەستێکم
قـەیس مـەیل لەیـل بێ خِلافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جـافێکم

❊❊❊

«فەرهاد»«شیرین» شەکەر رازێکم
نازار باوان نازئەندامێکم
سەییاد دڵگیر نۆپەردازێکم
دام دڵ پارە دەست بازێکم
پەروانەی باڵبەست کۆی کڵافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جافێکم

***

سۆزان ئایر شەوق نوورێکم
شێویای شێوەی شەم دەستوورێکم
هەراسان نە زێد زامن دوورێکم
قەیس ناوێنای دیدە کۆرێکم
دێوانەی مەشهوور قاف تا قافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جافێکم

***

وێڵ مەینەت مەشق هەراسانێکم
گرفتار دەست خورشید سانێکم
لێوەی لەنگ پۆس خەم نە شانێکم
دهەیری لاڵ لەنگ بێ زووانێکم
ئاوارەی ئاهووی مشکین تافێکم
کوشتەی نیگای ناز شەخس جافێکم

***

(٤٥)

## یاران کەردەن ڕێش

یاران کەردەن ڕێش، یاران کەردەن ڕێش

یە جەرگ منەن خاران کەردەن ڕێش

یە دیدەی منەن نوور نەمەندەن تێش

یە زام منەن زوخاو مەیۆ لێش

یە دوود منەن دنیا گرت نەوەر

یە سۆز منەن سۆزان دەشت و دەر

یە ئاه منەن وە ئاسمان یاوا

سەقف سەراچە گەردوون شکاوا

یە سەدای منەن نەفخ سوور بێزان

وەختەن قیامەت مەحشەر ئەنگێزان

یەناڵەی منەن چون نەی مەدۆ دەنگ

مەیۆ وە قانوون مەتاونۆ سەنگ

یە زاری منەن پۆسە زگارەن

عاڵەم جە زاری من بێ قەرارەن

یە شین منەن شەوان تا بە ڕۆ

چون «قەیس» مەجنوون هام نە بێد و کۆ

یە وێڵی منەن جە سوب تا ئێوار

دەور مەدۆ نە دەور سارا و سەردیار

یــە داخ مــنەن داخــان جــە داخــان
داخ کـــەردەن لالەی هــەرد ئــێڵاخان
هــامسەران وەخــتەن وادەی مـەرگم بـۆ
من جە دووری دۆس گوڵگۆن بەرگم بـۆ

***

(٤٦)

## یاران نەووەهار

یــــاران نـــەووەهار، یـــاران نـــەووەهار
ئــــیمساڵ وە بــــەختم بـــێفەڕ نـــەووەهار
ئــــاما وە دامــــان کـــۆچ تـــەڵمیت بـــار
هــەر چــەند نــیگام کــەرد نــەدیم کـۆچ یـار
خــــێڵان گشت ئــــامان وە ژێـــر دامـــان
پــــەخش بـین وە دامـــان بــارگەی ئـیمامان
نـــە کـــۆچ یـــار بـــێ، نــە دەنگ یــاران
وەهـــــــــار وەنـــــــــەمبی وە ژار مـــــاران
هــەرگــوڵ جــە ڕەنگــێ بـەرئاما جـە خـاک
ئــــەوان گـــوڵخەندان مــن دیــدە نــمناک
هــــەر غــــونچە وەنــــەمبی وە پــــەیکانێ
هــــەرگــــوڵێ وە نــــێش خـــار هــجرانــێ
هــــەر لالە داخــــێن وە ســــەد هـــەزار داخ
داخ مـــــەنیا وە دڵ حـــــەسرەتکێشم ئـــاخ

سـونبوڵ چـون فـێشتەر نـێش مـەدۆم نـەدڵ
تـێژتەرەن جـە خـار نـە پـام بـەرگ گـوڵ
نـەرگس مـەوینۆ ئـەندۆم بـەرز مـەبۆ
ئـاهر وە جـەستەم قـەقنەس تـەرز مـەبۆ
سـۆسەنان زووان تـانەکـێشان لێـم
جـە داخ دووری دوور وڵات ویـم
سـەیر چـەمەن لێـم چـون ژار مـارەن
هـەر ئـێد مـەژنەوون مـاچان وەهـارەن
پـەی چـی جـە دووری شـای شـەم جـەمینم
هـا وەخـتەن بـەرشۆ گـیان شـیرینم
یـاران هـامسەران سـا چـون مـەبۆ چـوون
من «تەبەس» جامەن «شەم» کەوت ئەو سەرتوون

تەواو

❊❊❊

# پێرست و ناواخن

سڵاو لە گیانی پاکی پەروانە
لەو عەشقە پاکەی بێ لەکە و جوانە
دیسان لە گیانی «شەمی» رومەت ئاڵ
کە پەروانەکەی کردە کۆی زوخاڵ

رازی





ISBN 964-7638-71-X
9 789647 638715

سنندج ، پاساژعزتی
انتشارات کردستان
تلفن: ۲۲۶۵۳۸۰۲